بۆ لازۆ، تاکە سەبووری من لە کووچەی

شارە دڵڕەقەکاندا.

بۆ خۆشم باوەڕم نەدەکرد چۆن لەپڕ و بەبێ هیچ پێشینەیەک بووم بە خاوەن پارەیەکی زۆر و بەمەش توانیم خەونێکی سەردەمی لاویم بێنمە دی کە کردنەوەی خانەیەک بوو بۆ ئەو کەسانەی دڵتەنگن و خەمۆکی قورس یان نەخۆشی دەروونییان هەیە.

ئێوارەیەکی خۆشی مانگی ئۆگۆست بوو لەگەڵ هاوڕێکانم بەلای گازینۆیەکدا ڕابردین. من کەموزۆر مەیلم لە سەردانی ئەو جۆرە شوێنانە نەبوو، بەڵام هەر تەنیا بۆ ئەوەی ڕیزی هاوەڵان تێکنەدەم و لە میزاجی ئەوان نەدەم، هیچ بەسەر خۆم نەهێنا و لەگەڵ ئەواندا خۆم بە گازینۆکەدا کرد کە پڕ بوو لەو پیاوانەی دووای ئەوەی دڵنیا ببوون بە کارو ڕەنجدانی زۆر دەوڵەمەند نابن خوویان دابۆ کڕینی بلیتەکانی یانسیب. برادەرەکانم هەر بە گەیشتنمان سەرو بلیتێکی یانسیبیان کڕی و هەرچۆنێک بوو بە زۆرەملێ دانەیەکیشیان دا بەمن. منیش پێش ئەوەی بلیتەکە بخەمە گیرفانم سەیرم کرد بەپێی ئەو ژمارەیەی کە لەسەر لای ڕاستی بلیتەکەم بوو هەر تەنیا بۆ ئەو یانسیبە ملیۆنێک و هەشتسەد هەزار بلیت فرۆشرابوو. ئەوەش ژمارەیەک بوو کە ئەگەری دەرچوونی بلیتێکی هەر یەکجار زۆر کەمدەکردەوە، بە تایبەت بۆ منێک کە قەت خۆم بە پیاوێکی بەبەخت

نەزانیبوو. بە لاقرتێیەکەوە بە هاوڕێکانمم گوت کە ئێمە ئەوەندە نەگبەتین بگرە لە سێ بلیتیش ناکرێت دانەیەکمان بۆ دەرچێت نەک لە ملیۆنێک و هەشتسەدهەزار دانە. هاوڕێکانم زۆر قسەیان لەو بارەیەوە نەکرد چونکە ئەوانیش مەسەلەکەیان هێندە بە گرنگ وەرنەگرتبوو. ئەو شەوەش دووای ئەوەی تەلەفۆنم بۆ هەموویان کردو پێم گوتن پلەی یەکی یانسیبەکە بۆ من دەرچووە کە نرخەکەی دوو ملیۆن پاوەندە کەس بڕوای پێنەکردم.

ئەو کاتەی من گەنجێکی نۆزدە ساڵان بووم دایک و باوکم لێک جیابوونەوە. ئەوان دواجار توانیان کۆتایی بە گرفت و لێکحاڵینەبوونێک بێنن کە بیست ساڵی خایاند. من بە بەردەوام سەردانی هەردووکیانم دەکرد. باوکم لە برادفۆرد بە تەنیا لە شوققەیەکی خراپدا دەژیا و دایکیشم لە گەڵ پیاوێکدا کە هەر ماوەیەکی کەم دوای جیابوونەوەی لە باوکم شووی پێکرد لە لیڤەرپووڵ لە خانوویەکی مامناوەندیدا دەژیا. زڕباوکەکەم ناوی ئییان بوو. ئییان پیاوێکی ملئەستووری ڕەزاگران بوو و هەموو شان و ملی خۆی بە وێنەی بازو هەڵۆو مار کوتابوو. ئییان لە یەکێک لە کارگەکانی شەریکەی فۆرد بۆ دروستکردنی سەیارە کاری دەکرد و هەموو خەون و خولیایەکی، وەک هەر پیاوێکی ئینگلیزی تر، سەیر کردنی یاری تۆپی پێ بوو. با کەس وا تێنەگات کە من دەمەوێت

غەیبەتی ئییان بکەم، نا مەسەلەکە غەیبەت نیە بەڵام لە دەمی سەیرکردنی یارییەکی تۆپی پێدا لە ئینگلاند دەبینم ئەوکاتەی یاریکەرێک گۆڵێک لە تیپەکەی بەرامبەر دەکات دەیان هەزار پیاوی ورگزل خۆیان بەرز دەکەنەوە و ئەو هەموو بەز و چەوریەی زگ و شان و ملیشیان لە گەڵ خۆیاندا بەرز دەکەنەوە، دیارە ئییانەکەی لە مەڕ دایکیشم یەکێکە لەوان، بە دەست خۆم نیە پێکەنینم دێت. بەڵام من ڕۆژێکیش چییە تاقەتی باسکردنم لە تۆپی پێ نەبووە. من ئەو جارجارەی کە دەچووم سەردانی دایکم بکەم، هەر بۆ خۆشیی حەزم دەکرد ئییان پەست بکەم، بۆیە گەرچی سوور دەمزانی ئەو هاندەری یانەی لیڤەرپووڵە، کەچی بە ئەنقەست دەمگوت "یاریچیەکانی  یانەی لیڤەرپووڵ خۆشیان بتۆپێنن ناتوانن لە یانەی مانچستەر یونایتدی بەرنەوە". لەو کاتەدا ئییان بەو شان و ملەیەوە کە هەر ڕێک لە گایەکی ئیسپانی دەچوو، مۆڕەیەکی لێدەکردم بەڵام لە بەر دایکم نەیدەویست هیچ بڵێت. لەبەرامبەردا ئییان هەقی ئەوە دەیتوانی ڕووی خۆش نەبێت لە گەڵمدا . . کەمترین قسەم لە گەڵ بکات . . کەمترین موجامەلەم بکات و ئەو کاتانەش سوعبەتم لە گەڵ دایکمدا دەکرد ئەو هیچ پێنەدەکەنی. دیارە من پێم خۆش نیە بە خراپە باسی ئییان بکەم – نا ئەو پیاوێکی خراپ نیە، بەڵام دڵنیام ئەو هەرگیز ناتوانێت بە ئەندازەی باوکم بەرامبەر دایکم میهرەبان

بێت. لە ڕاستیدا پەیوەندی دایکم و ئییان بۆ من زۆر جێگای لێووردبوونەوەیە نەک ووردبوونەوە لە پەیوەندی نێوان باوکم و دایکم یان دایکم و ئییان، بگرە بۆ تێگەیشتن لە پەیوەندی نێوان مرۆڤەکانی تریش. من چاک لە بیرمە  ئەو کاتەی دایکم لەگەڵ باوکمدا پێکەوە دەژیان لە سەر بچووکترین و سادەترین شت قیامەتێکی سازدەکرد، کەچی هەر ئەو دایکەم بۆ شتی زۆر جددیتر و کێشەی زۆر گەورەتر بەرامبەر ئییان بە سەبرترە. بۆ نمونە ئەگەر باوکم ڕۆیشتبا بۆ موبەقەکە و چایەکی بۆ خۆی تێکردبا و بەهەر هۆیەک بووایە بیری چووبا چایەکیش بۆ دایکم تێبکات، ئەوا دایکم دوو ڕۆژ خۆی لە باوکم مۆن دەکرد، کەچی ئێستا جاری وا هەیە ئییان شەش کوپ قاوە لە سەر یەک دەخواتەوە و ئینجا سێ بتڵ بیرەی بەسەرا دەکات بە بێ ئەوەی فەرمووی دایکم بکات لەگەڵ ئەوەشدا دایکم مێشێک میوانی نیە. لە بەرامبەریشدا باوکم ئەو تەنیاییە تۆقێنەرەی هەڵبژارد کە ئێستا تیایدایە و ژیانی لەگەڵ دایکمدا ڕەتکردەوە. من خۆم کە دەروونناسییم خوێندووە، زۆر جار بیر دەکەمەوە و دەڵێم ئەرێ بەڕاست بەشەر چی دەوێت. دەپرسم ئەرێ بەشەر بۆ بەهیچ ڕازی نیە. بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە چەندان لێکدانەوەم داناوە، بەڵام هیچیان قایلکەر نەبوون. حەز دەکەم ئەوەش بڵێم من خۆم چەند بیرۆکەیەکم دەربارەی ئەو مەسەلانە

دارڕشتووە بەڵام جارێ بۆ کەسیان باسناکەم چونکە خەڵکی ئەم زەمانە خوا خوایانە قسەیەکیان لە تۆ گوێ لێبێت و بچن لای کەسانی تر بە قسەو بیرۆکەی خۆیان بیفرۆشنەوە. بەڵام هێندە هەیە من دەتوانم بڵێم دایکم و باوکم ڕەنگە یەکتریان زۆر خۆشویستبێت بۆیە چاوەڕوانییشیان لە یەکتر زیاتر بوو، بەڵام ئێوە پیویست ناکات یەکسەر بیرتان بۆ ئەوە بچێت گوایە من دەمەوێت بڵێم دایکم ئییانی خۆشناوێت بۆیە چاوەڕوانییشی زۆر نیە لێی و پێشتان وابێت هەر لە بەر ئەوەشە ئەو کاتەی شەش کوپ قاوە هەڵدەقۆڕێنێت و دایکم بە خەیاڵیدا نایە. من خۆم حەز ناکەم بچمە ناو ئەو باسەوە کە دایکم ئییانی خۆشدەوێت یان نا، بەڵام ئەوە دەزانم ئەو کاتانەی من سەردانی دایکم دەکەم و ئییان بە فانیلەیەکی عەللاگەی شینەوە دادەنیشێت و کتومت وەک یاریچیەکانی مولاکەمە دێتە بەرچاوم لە کاتی پشوودانداا، ئینجا دایکیشم بۆ ئەوەی وای پیشان بدات کە دڵی بە ئییان خۆشە دەست بە شان و ملیدا دێنێت. دیارە من ئەوەم بەلاوە خۆش نیە دایکم لە بەرچاوی من دەست بە شان و ملی پیاوێکدا بێنێت، بە تایبەت کە من باوکمم زۆر خۆشدەوێت، بەڵام پیاو ڕاست بڕوات ئەوەش دەزانم ئییان بۆ مەسەلەی خۆشەویستی دایکم لە دۆخێکدا نیە کە نە باوکم و نە هیچ کەسێکی تر ئێرەیی پێ ببات.

ئەو ڕۆژەش دووای ئەوەی چووم بۆ لای دایکم و پێم گوت کە یانسیبێکم بە پلەی یەک بەبڕی دوو ملیۆن پاوەند بۆ دەرچووە، ئییان هەوڵیدا زۆر خۆی خۆشحاڵ پیشان نەدا، بەڵام هەرچۆنێک بوو ئەو دەیزانی من یارمەتیەکی باشی دایکم دەدەم، دیارە ئەوەش بێگومان بە قازانجی ئییان تەواو دەبوو. هەر ئەو ڕۆژەی چووم بۆ لای دایکم، بۆ بەیانیەکەیشی سەردانی باوکمم کردو باسی یانسیبەکەم بۆ کرد و دوو هەفتە لە لای مامەوە. لەو دوو هەفتەیەدا توانیم خانوویەک بۆ باوکم بکڕم ئەوەش وای لە باوکم کرد لە خۆشیان بە شێوەیەکی وا ناعادەتی پێبکەنێت وەک ئەوەی جنۆکە ختووکەی بدەن. من ئەوەشم بۆ باوکم باسکرد کە لای دایکم بووم، ئەو بە گاڵتەیەکەوە پرسی "ئەی کابرای مل ئەستوور خەریکی چییە؟". مەبەستی ئییان بوو. هەڵبەتە من هیچ وەڵامێکم نەدایەوە، هەر وەک چۆن باوکیشم چاوەڕێی هیچ وەڵامێک نەبوو. ئەو ماوەیە من نەخشەو پلانی خۆم بۆ باوکم باسکردو پێم ڕاگەیاند کە دەمەوێت بەو پارەیەی هاتۆتە دەستم سێنتەرێکی تایبەتی پێ بکەمەوە بۆ ئەو کەسانەی کێشەی خەمۆکییان هەیە، ئەوەش ڕێک خولیاو ئارەزووی من بوو لەو کاتەوە کە گەنج بووم و لە زانکۆی لەندەن قوتابی بەشی دەروونناسی بووم. هەڵبەتە باوکم بیرۆکەکەی

بە لاوە سەیر نەبوو چونکە زۆر دەمێک بوو لەمنی بیستبوو هەر کاتێک پارەم هەبێت یەکەم پرۆژەم کردنەوەی ئەو خانەیە دەبێت.

دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆری خۆم و یارمەتی هاوڕێکانم و ئەو دەستگیرۆییەی حکومەت لە پرۆژەکە کردی توانیم سێنتەرەکە بکەمەوە و گروپێکی گەنجی چالاک بخەمە کار تیایدا کە شەووڕۆژ بێوچان بە دڵسۆزیەوە کاریان دەکرد. من خۆم ئیشە گرنگە ئیداریەکانی بنکەکەم هەڵدەسوڕاند و جارجارەش سەردانی ئەو بەشەم دەکرد کە وەک کتێبخانەیەک وابو و لەوێدا نەخۆشەکانمان دەیانتوانی کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامەکان بخوێننەوە.

لە یەکێک لەو ڕۆژانەدا ژنێک و کچێکی گەنج پێکەوە هاتن بۆ لام و دیار بوو ژنەکە دایکی کچەکەیە. وەک بەشێک لە ڕۆتینی کارەکانمان دەبوایە من بە جیا قسە لە گەڵ دایکی کچەکەدا بکەم سەبارەت بە کچەکەی. دوای قسەو وتوویژ تێگەیشتم کە دایکەکە کچەکەی هێناوە بۆ ئەوەی لە بنکەکەمان وەک هەر یەکێک لە نەخۆشەکانی ترمان مەشق و ڕاهێنانی پێبکەین. دایکەکە پێشی ڕاگەیاندم کە کچەکەی ئەو بە هۆی ئەوەی ناتوانێت قسە بکات، بایەخێکی زۆر جیاوازی پێویستە. وەک هەر کەسێکی تری ئاسایی لەوانەی تووشی خەمۆکی دەبن ئەو کچەشمان لە بنکەکەمان ناونووس کرد و ژوورو جێگەو

ڕێگەی تایبەتمان بۆ دابین کرد. هەر بەو هۆیەوە کە ئەو توانای قسەکردنی نەبوو، ئێمە مامۆستاو چاودێر و پەرستاری تایبەتمان بۆ دانا.

من ئەو جارانەی سەردانی کتێبخانەکەمانم دەکرد، ئەو کچەم دەبینی بە تامەزرۆییەکی زۆرەوە خەریکی خوێندنەوەی کتێبە و ئەو کتێبانەشی کە بەدەستیەوە دەمبینی زۆربەیان کتێبی ڕۆماننووسە گەورەکانی دنیا بوون.  ئەو کچە ناوی ئۆفیلیا بوو و بە دەست خەمۆکیەکی قورسەوە دەینالاند و ڕۆژ بە ڕۆژیش خەمۆکیەکەی گرانتر دەبوو. زۆر جار ئۆفیلیا داوای هەندێک کتێبی دەکرد کە لە کتێبخانەکەمان نەبوو، بەڵام من هەرچۆنێک بووایە هەوڵم دەدا بۆی پەیدا بکەم. لە کۆتایی ئەو ساڵەدا هەر بۆ سەرقاڵکردنی نەخۆشەکان پێشبڕکێیەکمان کردەوە بۆ جووانترین دەقی نووسراو لەلایەن نەخۆشەکانەوە وخەڵاتێکیشمان بۆ کەسی براوە دانا. بۆ ڕۆژی دوواتر ئۆفیلیا هاتە ژوورەکەم و بە ئاماژەو نووسین تێیگەیاندم کە ئەو دەیەوێت کتێبێک بنووسێت بەڵام نایەوێت بەشێک بێت لە پێشبڕکێکە. ئەوە بوو من بێ دوودڵیی ڕازی بووم چونکە هەموو مەرامی ئێمە ئەوەبوو نەخۆشەکانمان بە ئاراستەیەکدا بەرین کە دووریانخاتەوە لەو نیگەرانی و بێئومێدیەی تێیکەوتوون. بۆیە ئەو کاتەی ئۆفیلیا خۆی هات و پێشنیاری نووسینی کتێبێکی کرد، من

خۆشحاڵ بووم و بە کارمەندەکانم ڕاگەیاند کات و بەرنامە و پشووی تایبەت و جێگای بۆ دابین بکەن بۆ  ئەوەی بتوانێت لە دۆخێکی ئاساییدا هەرچیەکی دەیەوێت بینووسێت. ئەوە بوو ئۆفیلیا لە سیستمی ئاسایی بنکەکە جیابۆوە و ڕۆژانەو شەوانە خەریکی نووسین بوو.

ئەم کتێبەی ئێستا لە بەردەستی ئێوەدایە  ئەو کتێبەیە کە ئۆفیلیا لەو ماوەیەدا سەرقاڵی نووسینی بوو. دوای شەش مانگ ئۆفیلیا هات بۆ لام و ئاگاداری کردم کە لە نووسینی کتێبەکەی بۆتەوە، بەڵام زۆر لاوازترو بێتاقەتتر لە جاران دیار بوو. پێش ئەوەی من داوای لێبکەم بۆ ئەوەی کتێبەکەیم بداتێ بیخوێنمەوە ئەو لە جانتاکەی دەستیدا کتێبەکەی دەرهێنا و دایە دەستم. بەڵێ - ئەم کتێبەی ئێستا ئێوە دەیخوێننەوە کچێکی بیست و شەش ساڵان کە توانای قسەکردنی نەبو و ناوی ئۆفیلیا  بوو، نووسیویەتی. دەبێت ئەوەش بڵێم لەو ڕۆژە بەدوواوە ئۆفیلیا باری دەرونیی خراپترو خراپتر دەبوو، تا وایلێهات ئێمە ناچار بووین ڕەوانەی نەخۆشخانەی تایبەت بە نەخۆشیە عەقڵیەکانی بکەین. بۆ دوایەمین جار کە من ئۆفیلیام بینی لە نەخۆشخانەیەک بوو و لە ژورێکی ناخۆشدا لەنێوان دوو چاودێری ڕەزاگراندا دانرابوو. ئەو چاوەکانی بەشێوەیەکی ترسناک سوڕابو و قژی ئاڵۆسکاو بوو و لە هەر کاتێکی تر لاوازتر دیار بوو.

ئەوە هەمان ئەو ڕۆژە بوو من بە زەردەخەنەوە پێمگوت "ئۆفیلیا چۆنێت؟" ئەو هیچ ئاماژەیەکی واینەدا بەوەی من دەناسێتەوە. نەک هەر ئەوە، بگرە دەمی لێپانکردمەوە و زمانی لێدەرهێنام. من لەو ڕۆژە بە دوواوە ئیتر نەمویست هەواڵی ئۆفیلیا بزانم، بەڵام بۆ من کە بە هۆی پسپۆڕیەکەم و کارەکەمەوە ساڵانێکی زۆر لە نزیک ئەو کەسانەوە بووم کە نەخۆشی عەقڵی و دەروونیان هەیە مەسەلەکە ئەوەیە ئۆفیلیا ئێستا ئەگەر نەمردبێت ئەوا بە دڵنیایەوە لەو نەخۆشخانەیەدا بە هۆی خراپتربوونی باری دەروونییەوە هەزارجار وەزعی لە وەزعی مردوویەک خراپترە. هەر ئەو ڕاستیەشە وادەکات من نەمەوێت هیچ هەواڵێکی ئەو بزانم. بەڵام وەک یادێکی ئەو و وەک وەفاداریەک بۆ ئەو کچە گەنجەی ڕۆژانێک بە هێمنی و ڕەزاسووکی و ویقاری گەنجانەی خۆی بنکەکەمانی ئاوەدان کردبۆوە، من لێرەدا ئەو کتێبەی کە ئەو لە ژووری ژمارە هەشت لە قاتی دووەمی بنکەکەمان نووسی، وەکو خۆی بڵاو دەکەمەوە. با ئەوەش بڵێم ئەگەر هەر پرسیارێکمان هەبێت سەبارەت بە ناوەرۆک وچۆنیەتی ڕوودانی ئەو ڕووداوانەو داوای هەر ڕوونکردنەوەیەکی زیاتر بکەین تازە زۆر درەنگە، چونکە ئۆفیلیا ئیتر لە بارودۆخێکدا نیە وەڵامی هیچ پرسیارێکمان بداتەوە. بۆیە ئەی ئەو کەسەی ئەم کتیبە دەخوێنیتەوە مەپرسە، هەر وەک چۆن منیش ناپرسم، هەرگیز

مەپرسە ئەو ڕوداوانە چۆن ڕوویانداوە، مەپرسە کامەی ڕاستە و کامەی فەنتازیا، مەپرسە ئەو کچە ژیکەڵەیە لەکوێ ئەو وردەکاریانەی زانیوە، چونکە تازە زۆر درەنگە، زۆر درەنگ.

# خەنجەرەکانی نیوەشەو

## خوسرەوی ڕابردووی دەستنووسێک دەخوێنێتەوە

دوانیوەڕۆیەکی خۆشی بەهاریساڵی ١٦٩٢ بوو. ئەحمەدی خانی لە سەر سەکۆیەکی بچکۆلە لە حەوشەکەی ماڵی خۆیان دانیشتبو و گوێی لە باوکی گرتبوو ئەو کاتەی باسی جموجوڵی گروپێکی بۆ دەکرد کە وەک شێرپەنجە بەناو قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریای

عوسمانیدا بڵاوببونەوە و لە هەر کوێیەک دەستنووسێکی گرانبەهایان دەستکەوتبا دەیانسوتاند. ئەحمەدی خانی کاتێک گوێی لە قسەکانی شێخ ئەلیاسی باوکی دەبێت بە تەواوی ترس دایدەگرێت. ئەو پێشتر هەندێک شتی دەربارەی دەستەی "خەنجەرەکانی نیوەشەو" بیستبوو، بەڵام قەت لەو باوەڕەدا نەبوو ئەوان تا ئەو ڕادەیە بەهێز بن بتوانن دەستنووسەکان لە قایمترین و ئەمینترین شوێنەکانی ماڵاندا بدزن و بیانسووتێنن.

"ئەی باشە ئەوان کە هێند بە دەسەڵاتن بۆچی تا ئێستا نەیانتوانیوە دەستنووسی کۆمەڵە شیعرەکانم بدزن؟" ئەحمەدی خانی بە خەیاڵێکی پەرت و تۆنێکی گوماناوییەوە پرسیاری لە باوکی کرد.

شێخ ئەلیاس پرسی: مەبەستت کۆمەڵە شیعری 'عەقیدەی ئیمان'ە؟"

ئەحمەدی خانی بە کەمێک پێداگریەوە گوتی "بەڵێ ئەوەو فەرهەنگە کوردی و عەرەبیەکەشم 'نەوبەهارا بچیکان'. بابە تۆ بۆخۆشت دەزانی دەستنووسی شیعرەکانم ساڵانێکی زۆر لەلای فەقێکانمان بوون و بگرە سوختەکانیش خوێندوویانەتەوە و دەستاودەستی زۆریشیان کردووە؛ فەرهەنگەکەشم دوو ساڵی ڕەبەق لە لای مەلاکانی ناوچەی هەکاری بووە"

شێخ ئەلیاسی باوکی ئەحمەدی خانی وەک پیاوێکی کەمدوو و بە حیشمەت، بە هێمنی گوتی "کوڕم ئەحمەد! وریابە دەستەی 'خەنجەرەکانی نیوەشەو' هەموویان خوێندەوارو فێڵبازن و هەتا دەستنووسێک نەخوێننەوە و بەتەواوی هەڵینەسەنگێنن و لە دەگمەنییەکەی تێنەگەن نایسووتێنن". ئیتر ئەحمەدی خانی تێگەیشت کە باوکی زۆر سەرسامە بە 'مەموزین'ەکەی و وای لێکدایەوە باوکی لەو قسانە مەبەستی ئەوەیە کە دەستەی 'خەنجەرەکانی نیوەشەو' خۆیان نەیانویستووە دوو دەستنووسەکەی تری بسووتێنن، بەڵام بێگومان دەیانەوێت و هەوڵدەدەن 'مەموزین' بدزن و بیسووتێنن.

ئەحمەدی خانی ئەو ڕۆژە، تەنانەت ئەو کاتەش لە 'مزگەوتی مرادییە'دا کە هەر ڕێک لە تەنیشت ماڵی خۆیان لە شاری بایەزیددا بوو، پێشنوێژی بۆ کۆمەڵێک خەڵک دەکرد، هەر بیری لای قسەکانی باوکی بوو.. ئەو زۆربەی کاتەکانی لەو مزگەتەدا بەسەر دەبرد. ئەو مزگەوتە سوڵتان مرادی دووەم لە ناوەڕاستی سەدەی پانزەدا دروستی کردبوو. دوای ئەوەی لە نوێژەکەی بۆوە، کەمێک خۆی لە ناو میحرابەکەدا دوا خست و خۆی بە سەیرکردنی ئەو کەوانە بەرزەی لەسەر میحرابەکە کێشرابو و دەستکردی وەستاباشیە عوسمانیەکانی ئەستەمبوڵ بوو، خەریککرد. دوای ئەوەی خەڵکەکە وردە وردە لە مزگەوتەکە ڕۆیشتنەدەر، ئەو یەکڕێ خۆی کرد بە

حوجرەی فەقێکاندا و کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ یەکێک لە فەقێیکان. ئەو فەقێیە ناسرابوو بە خەتخۆش و ئەحمەدی خانی متمانەیەکی زۆری پێی بوو. پاش ئەوەی ئەحمەدی خانی چەند قسەیەکی لەگەڵ فەقێکەدا کرد، بەیەکەوە بەرەو ماڵی خۆیان ڕۆیشتن.

دوای ئەوەی ئەحمەدی خانی و شێخ ئەلیاسی باوکی و فەقێکە خواردنی ئێوارەیان خوارد، ئەحمەدی خانی ڕووی کردە فەقێکەو پێی گوت کە کتێبێکی نووسیوەو دەیەوێت چەند دەستنووسێکی لەبەر بگرێتەوە بۆ ئەوەی ئەگەر یەکێکیشیان فەوتا یەکێکی تریان هەر بمێنێت. بەڵام شێخ ئەلیاس ئەوەشی بیر نەچوو بە فەقێکە بڵێت کە ئەو کارە دەبێت زۆر نهێنی بێت و کارەکە دەبێت لە ماڵی خۆیان و لە ژوورەکەی ئەحمەدی خانیدا بکرێت. فەقێکە هەم لە خۆشیی ئەوەی ئەویان بە خۆشنووسێکی تایبەت داناوەو هەم لە خۆشی ئەوەیش متمانەیەکی زۆری پێدراوە بەوەی کە بە شایستەی ئەوە زانراوە نهێنیەکی گرنگی بنەماڵەیەکی بەگزادەو خانەدانی وەکو ماڵی شێخ ئەلیاس بزانێت، زۆر کەیفساز بوو. لەو ڕۆژە بەدواوە فەقێکە هەموو ڕۆژەکانی لە ماڵی ئەحمەدی خانیدا بەسەر دەبرد و خەریکی نووسینەوەی دەستنووسی مەموزین بوو و لە ماوەی مانگێکدا دوو بەرگی لەبەر گرتەوە. ئینجا ئەحمەدی خانی یەکخەم بوو چونکە ئێتر سێ دەستنووسی مەموزینی لا بوو، کاتێکیش شێخ ئەلیاسی بابی

ئامۆژگاری کرد بەوەی هەر دەستنووسەی لە شوێنێکی جیاواز دابنێت، ئەحمەدی خانی بێدوودڵی بەقسەی کرد. یەکێک لە دەستنووسەکانی برد بۆ لای ژنێکی ئامۆزای خۆی. ئەو ئامۆزایەی مێردەکەی مەلا بوو و لە شاری ئورفە دەژیان. دەستنووسێکی تری برد بۆ بەتلیس بۆ ماڵی برادەرێکی خۆی. ئەو برادەرەی شەیدای شیعرەکانی مەلای جزیری و فەقێ تەیران بوو. دەستنوسەکەی تریشی واتە دەستنووسە بنەڕەتیەکەی خۆی هەر لای خۆی هێشتەوە.

*** *** ***

دەستەی خەنجەرەکانی نیوەشەو ڕاستەوخۆ لە لایەن یەکێک لە پیاوانی دەرباری سوڵتانەوە سەرپەرشتی دەکرا بەڵام دیار نەبوو کێیە. ئەوان ناوی خەنجەرەکانی نیوەشەویان لە خۆیان نابوو و ئەو ناولێنانەش پەیوەندی بە ڕووداوێکەوە هەبوو.

کاتێک ئەوان گرووپێکی بچووکی چەند کەسی ببوون و نەخشەیان دانابوو بۆ دزینی دەستنووسێک وەک یەکەم چالاکی خۆیان، ئەو کەسەی ئەوان دەستنیشانیان کردبوو دەستنووسێک لە ماڵی میرێک

لە هەرێمی جزیرە بدزێت هەمان مەیتەری ماڵی میر ببوو. نیوەشەو لەو کاتەدا مەیتەرەکە ویستبووی دەستنووسەکە بدزێت کە لە ژوورێکی قوڕینی بچووکدا دانرابوو، پاسەوانێک لە پاسەوانانی ماڵی میر پێی دەزانێت و هەوڵدەدات لەو تاریکیەدا کابرای دز دەستگیر بکات، بەڵام ئەو فریا دەکەوێت و خەنجەرێک لە دەستنووسەکە دەدات و بە خەنجەرەکە دەستنووسەکە هەڵدەگرێت و خۆی قوتار دەکات. لە دووای ئەو ڕووداوەوە ئەندامانی ئەو دەستەیە ناویان لە خۆیان نا خەنجەرەکانی نیوەشەو. ئەوان ساڵانێک پێش ئەوەی شێخ ئەلیاس باسی ئەوان بۆ ئەحمەدی کوڕی بکات چەندان دەستنووسی گرنگیان سوتاندبوو. لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەوە تا کۆتایی هەمان سەدە تەنیا لە وڵاتی فارس هەشت دەستنووسی دەگمەنیان دزیبو و دوواتر لە ناویان بردبوون ، لەناویاندا و گرنگترینیان دەستنووسێک بووە بە ناوی 'عالەمی مادده و ئەسراری ڕۆح' . ئەو دەستنووسە پیاوێکی خوراسانی بیست ساڵ بە نووسینیەوە خەریک بووە. ئەو پیاوە خوراسانیە دوای ئەوەی کتێبەکەی دەدزرێت هێندەی پێناچێت لە حەژمەتی لە دەستچوونی دەستنووسەکەی، عەقڵی لە دەست دەدات. دەگوترێ گوایە دوای ئەوە لە کۆڵانەکان بینراوە بە پێی پەتی سوڕاوەتەوە و کوفری کردووە و لەسەر ئەمەش ئوستانداری خوراسان گرتوویەتی و تا مردن لە زینداندا

هێشتوویەتیەوە. هەروەها هەر لەو ماوەیەدا نۆزدە دەستنووسیشیان فەوتاندبوو کە بەزمانی عەرەبی نووسرابوون. سەرەڕای ناوازەیی هەموویان، لەناو ئەو نۆزدە دەستنووسە گرانبەهایەدا دوو دەستنووس هەبووە و یەکجار دەلال بوون. یەکێکیان لە دیمەشق لە کتێبخانەکەی والی دزرابو، کۆمەڵێک شیعر بووە ئیبنولعەرەبی سالانێکی یەکجار زۆر پێشتر نووسیبوونی بەناوی'خەوتنی موحەممەد لە کڵێسادا'. ئەوەی دیکەشیان لە ماڵی دەروێشێک لە حەڵەب ڕفێنراوە و دەستنووسێکی ئیبنولخەلەکان بووە، ئەو دەستنووسەی ئیبنولخەلەکان تەفسیرێکی بەراوردکاریی تایبەت بووە لە نێوان گێڕانەوەی قورئان و تەورات بۆ سەرگوزەشتەی یوسف. هەروەها لە ناوچەکانی بۆتان و هەکارییش چوار دەستنووسیان فەوتاندبوو کە نووسەرەکانیان دیار نین کێ بوون، بەڵام باوەڕێکی باوی وا هەیە لەناو ئەو چووار دەسنووسەدا یەکێکیان کۆمەڵەشیعرێک بووبێت لە نووسینی فەقێ تەیران و مەلای جزیری و ئەو کاتەی فەقێ تەیران لە لای مەلای جزیری فەقێ بووە، بە یەکەوە نووسیبێتیان..

کاتێکیش دەستەی خەنجەرەکانی نیوەشەو ئەوە دەبیستن ئەحمەدی خانی کتێبێکی سەرنجڕاکێش و گرنگی نووسیوە، دەکەونە هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر بۆ پەیداکردنی. ئەوان لە ڕێگای سیخوڕەکانی

خۆیانەوە تەنانەت ئەوەشیان زانیبوو کە سێ نوسخەی لە بەر گیراوەتەوە، بۆیە کارەکەیان قورستر ببوو و دەیانەویست هەرچۆنێک بێت یەکەمجار نوسخەیەکی پەیدا بکەن و بیخوێننەوە بۆ ئەوەی بزانن ئەوە دەهێنێت کات و پارە بۆ دۆزینەوە و فەوتاندنی نوسخەکانی تەرخان بکەن یان نا. .

حەوت ساڵ بە سەر ئەو ڕۆژەی ئەحمەدی خانی دەستنووسەکانی 'مەموزین' بە سەر شوێنی جیاوازدا دابەش دەکات تێدەپەڕێت، بەیانیەکی زوو مەلاکەی ئورفە لە خەو هەڵدەستێت بۆ ئەوەی بچێت لە مزگەوت بانگبدات. مەلا ڕوودەکاتە مزگەوت و دووای بانگدان پێشنوێژی بۆ چەند پیاوێکی پیر دەکات. پێناچێت جگە لەو پیاوە پیرانە هیچ نوێژکەرێکی تر بۆ نوێژی بەیانیان ئامادە بووبێت. مەلاکەی ئورفە پیاوێکی خڕیلە بووە و ئەو کاتانەی بە ڕێگادا ڕۆیشتووە وەک ئەوە وابووە هەڵبەزێتەوە. ئەو بەیانیەش دوای نوێژەکە لە کۆڵانە نیمچە تاریکەکانی ئورفەوە بە هەڵبەز هەڵبەز بەرەو ماڵ دەبێتەوە. ئەو دەمەی دەگاتەوە ماڵەوە و لە ژوور سەری خۆیەوە لە ناو تاقەکەدا دەبینێت دەستنووسەکەی مەموزین نەماوە، بە شپرزەیی ژنەکەی لە خەو هەڵدەستێنێت و هاوار دەکات:

"چۆن دەستنووسێکی گەورە و گران لەماڵدا دزراوە و تۆ خەبەرت نەبۆتەوە "

مەلاکەی ئورفە هەزاران ختورەی کرد، دڵی لە دەیان کەس لە دۆستەکانی خۆی کرمێ کرد، بیری بۆ هەزاران شت چوو سەبارەت بە نەمانی دەستنووسەکە، بەڵام نە ئەو بەیانیە و نە ئەو سەدان بەیانیەی تریش کە بەدوایدا هات و تا ئەو ڕۆژەی مردیش هەرگیز دڵی بۆ ئەوە نەچوو ژنەکەی بە نهێنی سەر بە دەستەی خەنجەرەکانی نیوەشەو بێت. هەروەها دڵی بۆ ئەوەش نەچوو ئەو بەیانیە کەسێک هاتبێتە ماڵەکەی و تۆزێکیش خۆی لە ژنەکەی هەڵسوێبێت و ئینجا دەستنووسەکەشی بردبێت.

پێنج ساڵ دوای دزرانی یەکەم دەستنووس، دووەم دەستنووسیش دزرا. ئەحمەدی خانی دووەم دەستنووسی لای برادەرێکی خۆی دانابوو لە بەتلیس. ئەو برادەرەی پێشتر لە گەڵ ئەحمەدی خانی فەقێ ببوو ئینجا دوای ماوەیەک و دوای ئەوەی لەو توندوتیژی و گوشارەی مەلاکان دایاننابوو بۆ خوێندنی زانستەکانی کەلام و نەحو و سەرفی عەرەبی بێزار دەبێت، دەگەڕێتەوە شارەکەی خۆیان لە بەتلیس و لە گەڵ باوکی خۆی سەرقاڵی کاری مسگەری دەکات. ئەحمەدی خانی هەر کاتێک ڕۆیشتبا بۆ بەتلیس لە ماڵی ئەوان

دەمایەوە و شەوان تا درەنگ دادەنیشتن و باسی شیعرەکانی مەلای جزیری و بابا تاهیری عوریان و فەقێ تەیرانیان دەکرد. چیرۆکی ونبوونی ئەو دەستنووسەیان لەسەر دڵی ئەحمەدی خانی قورس دەبێت وتەواو خەمباری دەکات. ئەوەی زۆرتریش حەحمەدی خانی عەزاب دەدات ئەو بەدگومانیەیە کە بەرامبەر برادەرە بەتلیسیەکەی دایدەگرێت. کابرای بەتلیسی هەست بەوە دەکات ئەحمەدی خانی گومانی لێی هەیە بۆیە بە قورعان سوێندی بۆ دەخوات کە ئەو هیچ دەستی لە فەوتانی دەستنووسەکەدا نیە. ئەحمەدی خانی دواجار بڕوا بە برادەرەکەی دەکات، بەڵام ناشتوانێت ئەو دڵخۆشییە لە فەوتانی دەستنووسەکە فەرامۆش بکات کە بە شێوەیەکی نهێنی و ڕازدار لە سیمای برادەرەکەیدا دەدرەوشێتەوە.

ئەحمەدی خانی هەر لەو زەمانەوەی لە ئەستەمبووڵ فەقێ دەبێت هەست بەوە دەکات برادەرە بەتلیسیەکەی ئێرەیی پێدەبات. دوای ئەوەیش ئەحمەدی خانیش زانستەکانی شەریعەت پلە بە پلە دەبڕێت هەستی ئێرەیی لای برادەرە بەتلیسیەکەی گەورەتر دەبێت، بەڵام زۆرزانیەکەی وایلێدەکات بتوانێت ئەو هەستی ئێرەییە بشارێتەوە و ئەو هەستە بداتە ئەحمەدی خانی بەوەی ئێرەییبردنەکەی هیچ ئاسەوارێکی لە ژیانی ئێستایدا نەماوە. ئەحمەدی خانی ئەو ڕۆژەی دەستنووسەکەی بردبوو بۆ لای لە بەتلیس ئەوەی هەر بیر نەمابوو

ئەو برادەرەی سەردەمێکی زۆر هەوڵیدابوو فەقێیەکی زرنگ بێت و نەیتوانیبوو، ویستبووی  ببێت بە مەلاو شکستی خواردبوو، شیعری نوسیبو و لە باتی ئەوەی ببێت بە شاعیر وەک گاڵتەجاڕ دەرکەوتبوو. دواجار توانای ئەو برادەرە بەتلیسیەی لە خەونەکانی بچووکتر دەبن، بۆیە هەڵکوت هەڵکوت دەگەڕێتەوە و لە گەڵ باوکی مل لە دروستکردن و سپیکردنەوەی مەنجەڵە مسەکان دەنێت. دوای ئەوەی دەستنووسەکەش دیار نەما، ئەحمەدی خانی هەموو ئەو شتانەی بۆ شێخ ئەلیاسی بابی باسکردو بە ڕاشکاوی گومانی خۆی بەرامبەر کابرای بەتلیسی خستە ڕوو.

"ئەدی ئەگەر ئەو هەموو شتانە هەیە بۆچی ئەو دەستنووسەت برد بۆ لای ئەو؟" شێخ ئەلیاس بە تۆنێکی پڕ گلەیی و سەرزەنشتەوە ئەوەی بە ئەحمەدی کوڕی گوتبوو.

"من هیچ بەڵگەیەکم نیە ئەو دەستی لە ونبوونی ئەو دەستنووسەدا هەبێت. ئەوەی هەمە تەنیا گومانە. من هەمیشە ئەوم بە کەسێک زانیوە ئێرەیی پێبردووم، بەڵام قەت نەمتوانیوە باوەڕ بەوە بکەم ئەو هێندە نامەرد بێت ئەمانەتیەک بە ئەنقەست بفەوتێنێت" ئەحمەدی خانی بە نائومێدیەکی زۆرەوە ئەو قسانەی کردبوو.

ئەو شەوەی شێخ ئەلیاس و ئەحمەدی خانی ئەو قسانەیان کردبوو، شێخ ئەلیاس زۆر هەوڵیدابوو تێبگات کە چۆن کوڕەکەی کاتێک زانیویەتی ڕۆحی برادەرێکی ئاڵوودەیە بە ئێرەیی، کەچی لە کارێکی ئاوا گرنگدا پشتی پێبەستووە، بەڵام نەیتوانیبوو تێبگات. ئەحمەدی خانیش زۆر هەوڵیدا بوو باوکی تێبگەیەنێت کە برادەرایەتی و ئێرەیی هەمیشە درواسێی یەکترن، هەمیشە هەستی ئێرەیی بەرامبەر ئەو کەسانە داماندەگرێت کە بە ئەندازەیەک لێمانەوە نزیکن، ئەویش نەیتوانیبوو تێبگات.

پیاوە بەتلیسیەکە هەر لە هەرزەکارییەوە هەستی ئێرەیی بەرامبەر بە برادەرەکانی هەبوو، بەڵام هەمیشە لە ناوەوە هێزێک هەبوو تەریقی دەکردەوە. ئەو کاتەی مەم و زینی ئەحمەدی خانی خوێندبۆوە زانیبووی کتێبێکی گرنگە و تێگەشتبوو هەرگیز ناتوانێت ئەو کتێبە فەرامۆش کات، بەڵام نەشیویستبوو ئەو کتێبە بە شێوەیەک بفەوتێت کە ڕاستەوخۆ ڕۆحی ئازار بدات. ئەو کاتەی دەبیستێت گرووپی خەنجەرەکانی نیوەشەو عەودالّی دەستنووسەکەی ئەحمەدی خانین، چەند جارێک ختوورەی ئەوە دەکات بە هەر شێوەیەک بێت ئاگاداریان بکاتەوە لەوەی ئەو دەستنووسە لای ئەوە، بەڵام هەر کەمێک دوای ئەو ختوورانە خەفەتێکی زۆری خواردبوو لەوەی ئەو ئاڵوودەی ئەو جۆرە هەستانەیە. کابرای ئورفەیی لە نێوان دوو

ئاگردا دەسووتێت. لە لایەکەوە دەبینێت ئەحمەدی خانی هاوڕێیەکی نزیکی خۆیەتی و سەردەمێک بە یەکەوە و لە یەک حوجرەدا خوێندوویانە، لە یەک ژووردا خەوتوون، لە یەک خواردنیان خواردووە، کەچی ئەو مەموزین دەنوسێت و دەرس بە دەیان فەقێ دەڵێتەوە و ئەمیش ژیانی لە دروستکردن و گەڕان لەو گوندەوە بۆ ئەو گوند بۆ سپیکردنەوەی مەنجەڵە مسەکان بە با دەدات. ئەوەش دەبێتە هۆی پەستیەکی زۆر بۆی. لە لایەکی تریشەوە ئەو دەمانەی بیر لە ناجوامێری ئەو ختوورانەی خۆی دەکاتەوە شەرم دایدەگرێت. ئەو کێشمە کێشمە دەروونییە هەر بەردەوام دەبێت تا ڕۆژێک لەو کاتەدا ئەو لە گەڵ باوکیدا لە گوندەکانی دەوروبەری ئورفە خەریکی مەنجەڵ سپیکردنەوە دەبێت، دەستنووسەکە دیار نامێنێت. ئەو پیاوە بەتلیسیە پاش ئەوەی دەستنووسەکە دیار نامێنێت لە دڵەوە و بەنهێنی زۆری پێ خۆشدەبێت، بەڵام ویژدانیشی ئارامە بەوەی ئەو دەستی لە فەوتانی دەستنووسەکەدا نیە.

لەوساڵەدا ئیتر ئەحمەدی خانی هەم بەهۆی هەڵکشانی تەمەنیەوە و هەمیش بەهۆی ئەو خەمەی لە ئەنجامی دزرانی دەستنوسەکانی و ترسی بێمەودای ئەو لە دزران و فەوتانی دوادەستنووس، لەپڕ پیری بەتەواوەتی زەفەری پێدەبات. ئەوانەی لەوساڵەدا ئەحمەدی خانیان بینیبوو باوەڕیان بە چاوی خۆیان نەکردبوو بەوەی پیاوێک

ڕۆژانێک نموونەی دڵتەڕی و مەشرەبخۆشی بووبێت، گۆڕابێت بە پیرێک کە تاقەتی تاشینی ڕیش و ڕێککردنی سمێڵی نەمابێت و چەند ددانێکی تاق و لۆق لە دەمیا مابێت. ئیتر ئەحمەدی خانی پیاوە قسەخۆشەکەی جاران نابێت بەڵکو پیرێکی ڕەزا قورس دەبێت و گومان لە هەموو کەسێک و هەموو شتێک دەکات.

***        ***        ***

لەو ساڵانەدا لقێک لە گرووپی خەنجەرەکانی نیوەشەو لە هەرێمی جزیرە و بۆتان زۆر چالاک دەبن و سەرپەرشتیکردنەکەیان دەکەوێتە دەست پیاوێکی خەڵکی ماڵاتیا. ئەو پیاوە ماڵاتیاییە لە لایەن قەرە موستەفای برای موحەممەد ئەپریلی فەرمانداری سوپای عوسمانی کە ئەو کات یەکێک دەبێت لە سەرکردە هەرە دیارەکانی خەنجەرەکانی نیوەشەو، ڕادەسپێردرێت بە هەر نرخێک بێت دەبێت دوادەستنووسی مەم و زین بدزرێت. پیاوە ماڵاتیاییەکە ناوی شەوکەت دەبێت و هاوکارانی ئەو پێشتر دوو دەستنووسەکەی تری مەم و زین دەسووتێنن، بەڵام ئەو بە هەر هۆیەک بێت ئەو دەرفەتەی نەبوو مەم و زین بخوێنێتەوە، بۆیە هەم فزوولی خوێندنەوەی ئەو دەستنووسەو هەم بۆ ڕازیکردنی قەرە موستەفای

ئاغای دەکەوێتە خۆی بۆ پەیداکردنی دەستنووسەکە. شەوێکی درەنگی پایزی ساڵی ١٧٠٥ شەوکەت لە گەڵ دوو برای خۆیدا بە خەنجەرەوە خۆیان دەکەن بە ماڵی ئەحمەدی خانیدا. لەو کاتەدا ئەحمەدی خانی بە تەنیا دواساڵەکانی تەمەنی خۆی بە سەر دەبات. ئەو دەمەی دەچنە ژوورەوە سەیر دەکەن ئەحمەدی خانی خەوتووە و چراڕەشکەیەکی ڕۆنگەرچەکیش بە کزی دەسووتێت. دوو براکەی شەوکەت وەک پێشتر تەگبیریان کردبوو، پەلاماری ئەحمەدی خانی دەدەن و بە لێفە کۆنەکانی و سەرینێک دایدەپۆشن و توند بە لبادەکەی ژێریەوەی  شەتەک دەدەن. بەڵام بە هۆی ئەوەی ئەحمەدی خانی پیرو نەخۆشە، هیچ بەرهەڵستییەک ناکات. بۆیە شەوکەت بە ئەسپایی چراڕەشکەکە هەڵدەگرێت و کون بە کونی ماڵەکە دەپشکنێت تا دەستنووسەکە لە دەلاقەیەکی بچووکی ناو تەنووربانەکەدا دەدۆزێتەوە کە ئەحمەدی خانی هەر بۆ ڕێوێڵکە خستبوویە نێوان دوو بەرگی قورعانێکەوە. ئەو کاتەی شەوکەت لە ناو پەڕۆیەکی پێچراودا کتێبێکی قورس دەدۆزێتەوە و پەڕۆ پێچراوەکە دەکاتەوە و بەرگی قورعانێک دەبینێت زۆر نائومێد دەبێت. بەڵام لەو ساتەی کتێبەکە لێک دەکاتەوە و لە بەر چرا ڕەشکەکەدا پەڕەکانی هەڵدەداتەوە، دەبینێت بە کوردی لە یەکێک لە لاپەڕەکانی بە  خەتێکی درشت نووسراوە "مەم و زین".

*** *** ***

شەوکەت دەستنووسەکە لە گەڵ خۆی دەباتەوە بۆماڵی خۆیان لە ماڵاتیا، ئینجا یەکێک لە براکانی خۆی ڕەوانە دەکات بۆ ئەستەمبوڵ بۆ ئەوەی هەواڵی دەستنووسەکە بە قەرە مستەفا ڕابگەیەنێت.

ئەحمەدی خانی هەر دوای ئەوەی شەوکەت و براکانی ماڵەکەی بە جێدەهێڵن و ئەو بە دەست و قاچی بەستراوەوە لە پەنا ئاگردانێکی ساردەوەبوودا جێ دەهێڵن، لەرزو تایەکی توند دای دەگرێت و دوای چەند مانگێکی کەم بە حەسرەتەوە گیان دەسپێرێت.

ئەوەی شەوکەتی خستبۆ ناو ئەو جیهانە ناشیرینەوە لە بنەڕەتدا ئارەزووی ئەو نەبوو بۆ سووتاندنی ڕەنجی پیاوانی گەورە بەڵکو شەڕی بێئامانی ئەو بوو لە گەڵ ئەو نائارامی و بێئومێدیەی عەشقێکی ناکام لە دڵیدا هەڵیگیرساندبوو. بۆیە ئەو شەوەی دەست دەکات بە خوێندنەوەی دەستنووسەکە، هەر لە لاپەڕەکانی سەرەتاوە دڵبەستەی دەبێت. تا زیاتر بە خوێندنەوەی مەم و زیندا ڕۆدەچێت زیاتر دێوانەی شێوازی گێڕانەوە و ڕیزبەندکردنی بەیتەکانی ئەو داستانە دەبێت. شەوکەت ساڵانێک دوواتر باسی ئەو سەردەمەی گێڕابۆوە و دڵی بە هەمان خێرایی ئەو زەمانە کۆنە لێیدابوو.

ئەو دەمەی شەوکەت لە خوێندنەوەی دەستنووسەکەدا دەگاتە ئەو شوێنەی مەم لەگەڵ تاژدینی برادەری دەکەونە ناو پەیوەندیەکی ئاڵۆزو بە ئازارەوە لە گەڵ هەردوو کچەکانی میر زێندینی بۆتان ستیَ و زین، ئینجا زیندانیکردنی مەم لە لایەن میرەوە بە قسەی نۆکەرێک بە ناوی بەکر مەرگەوەڕ، دوواتریش دەگاتە ئەو شوێنەی مەم بە چ عەزابێکەوە لە زینداندا دەمرێت، عەشقی ناکامی خۆی بیردێتەوە ئەو کاتەی تازە لاوێک بوو بە تەواوی مووی ڕیشی نەهاتبوو و لە ترسی هەڕەشەی کەسوکاری گراویەکەی خۆی گوندەکەی خۆیان جێدەهێڵێت و لە گەڵ براکانی ڕوو دەکەنە ماڵاتیا. درەوشانەوەی ئەو برینانەی عەشقێکی کۆنەساڵ لە دڵی شەوکەتدا جێیهێشتبوون وادەکات شەوکەت هەست بە بێئارامی و پەشیمانیەکی زۆر بکات لە دزینی ئەو دەستنووسە، بەڵام تازە کارەکە بە شوێنێک گەیشتبوو کە گێڕانەوەی دەستنووسەکە بۆ ئەحمەدی خانی کارێکی مەحاڵ بوو، بە تایبەت چونکە یەکێک لە براکانیشی وەک پەیکێک ناردبوو بۆ ئەستەمبوڵ بۆ ئەوەی هەواڵی بەدەستخستنی دەستنووسەکە بگەیەنێت بە یەکێک لە سەرکردە نهێنیەکانی 'خەنجەرەکانی نیوەشەو'. ئەو نائارامی و هەست بە عەزاب کردنە دوواجار شەوکەت دەخاتە بەردەم بڕیارێکی سەخت. ئەو بڕیارە

ڕێڕەوی ژیانی خۆی و براکانیشی دەگۆڕێت. تا شەوکەت دەگاتە ئەو بڕیارە براکەشی لە ئەستەمبوڵەوە دەگەڕێتەوە.

ئێوارەیەکیان شەوکەت بە ڕاشکاوی نەخشە و بیرکردنەوەکانی خۆی بۆ براکانی دەخاتە ڕوو و پێیان ڕادەگەیەنێت کە ئەو نایەوێت ئەو دەستنووسە بداتە قەرە مستەفا. لە بەر ئەوە براکانی ڕازیدەکات دەستنووسەکە ببەن و هەموویان پێکەوە بەرەو ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆریای سەفەوی هەڵبێن. من وردەکاریەکانی چیرۆکی ڕاکردنی شەوکەت و براکانی نازانم. ئەوە نازانم ئەوان چۆن توانیویانە ئەو هەموو شاخ و ڕوبارو دەشتانە ببڕن و لە ڕێگادا تووشی چەند گوندو شاری نەناس بوون و لە چەند مەترسی و چەتە و ڕێگر دەرباز بوون. ئەوەی دەیزانم ئەوەیە ئەو کاتەی شەوکەت و براکانی ڕوودەکەنە ئەسفەهان، ئەو کات ئەسفەهان پایتەختی ئیمپراتۆریای سەفەوی دەبێت، دەوروبەری هەمان ساڵ شا سوڵتان حوسێن لە بەرامبەر یاخییە ئەفغانیەکاندا تێکدەشکێت و چەند ساڵێک دواتر سەفەویەکان بە یەکجاری دەڕوخێن. دوای ئەوەی نادر شا جڵەو دەگرێتە دەست و حوکمڕانی ئەفشاری دادەمەزرێنێت و مەشهەد دەکاتە پایتەختی فەرمانڕەواییەکەی، شەوکەت و براکانی بۆ یەکجاری ڕوودەکەنە مەشهەد و لەوێ نیشتەجێ دەبن. تەنانەت ئەو کاتەش مەشهەد جێناهێڵن کە نادر شا

تیرۆر دەکرێت و کەریم خانی زەند حوکمڕانی زەند دادەمەزرێنێت و پایتەخت دەگوازێتەوە بۆ شیراز و زۆر لە دانیشتوانی مەشهەد ڕوو دەکەنە شیراز بە تایبەت خوێندەوارو سنعەتکارەکان. دەساڵیک دواتر شەوکەت بە غەریبی دەمرێت بەڵام پێش ئەوەی بمرێت خەونێک دەبینێت و لەو خەونەدا پێی دەگوترێت نابێت ئەو دەستنووسە بهێڵرێت بفەوتێت و پێویستە وەسیەت بکات نەوەکانی پشتاوپشت بیپارێزن تا ئەو ڕۆژەی کەسێک دێت و نیشانەکانی دەستنووسەکە هەڵدەهێنێت و دەستنووسەکە دەبات. دوای ئەو خەونە شەوکەت وەسیەت دەکات و بە براو نەوەکانی دەڵێت ئاگایان لەو دەستنووسە بێت و تەنیا بیدەن بەو کەسەی ڕۆژێک لە ڕۆژان دێت و داوای دەکات، بەڵام ئەگەر داوای کرد ئێوە پرسیاری کۆمەڵێک نیشانەیَ لێبکەن و ئەگەر نیشانەکانی هەڵهێنا ئەوا دەستنووسەکەی پێبدەن. بە ماوەیەک دوای مردنی شەوکەت، براکانی ژن دەهێنن و وەچە دەخەنەوە و نەوە و تۆرەمەکانیان نەک هەر بە مەشهەد و دەوروبەریدا، بگرە بە هەموو ناوچەکانی ئێران و تووراندا بڵاو دەبنەوە. ئەو نەوانە ئەوەیان بیرنامینێت سەردەمێک باوک و باپیرانیان لە ناوچەیەکی دوورەوە لە پێناو ڕزگارکردنی دەستنووسێکدا ئاوارە بوون، بەڵام هەموویان بەبیَ ئەوەی بیر لە وردەکاریەکەی بکەنەوە پشت لە دوای پشت وەسیەت بۆ نەوەکانیان

دەکەن بۆ ئەوەی ئەو دەستنووسە بە شێوەیەکی قایمکارانە و لە شوێنێکی ئەمین بپارێزن و ئەگەر ڕۆژێک کەسێک هات و نیشانەکانی دەستنووسەکەی هەڵێنا، بیدەنێ.

*** *** ***

بەشی دووەم

# کوژرانی ئەو پیاوەی گوڵەکێویەکانی ماڵی دەکرد

دوو ڕۆژ دوای ئەو ئێوارە شوومەی کە باوکم بە شێوەیەکی یەکجار ناخۆش و لە کەشێکی سەیرو تاڕادەیەک نهێنیئامێزدا لە دوکانەکەی خۆیدا کوژرا، کوڕەکەی پوورم میلیاس بە سەردانێکی کورتی چەند ڕۆژە گەڕایەوە بۆ شارەکەی خۆمان بۆ لای ئێمە. بەو پێیەی میلیاس هاوڕێی منداڵی و هەرزەکاری من بوو، هەمووان

چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد من تەلەفۆنی بۆ بکەم و هەواڵەکەی پێ بڵێم. بەڵام من هەر لەو ئێوارەیەوە زمانم شکابو و قسەم بۆ نەدەکرا.

ئێوارە بوو من و دایکم بە مووبەقەکەدا دەهاتین و دەچووین. خواردنی ئێوارەمان ئامادە کردبوو و چاوەڕوانی گەڕانەوەی باوکم بووین. هێندەمان زانی لەپڕ بۆنی عەتر هەموو ماڵ و حەوشە و گەڕەک و کۆڵانەکەمانی تەنی. بۆنێکی قورس بو و وەک ئەوە وابوو بۆنی هەموو عەترەکانی دنیا لە تاقە بۆنێکدا چڕکرابێتەوە و بایەکی نادیار هێنابێتی بۆ ماڵی ئێمە. ئەو بۆنە نەک هەر بەرامەی پەنگخواردووی ناو ماڵەکەمانی داپۆشی، بەڵکو ڕەنگی ئەو ئێوارە تەماویەشی تاریکتر کرد کە بە نمەنمەی وردە بارانی ئەو وەرزە سارده شێدار ببوو. بە هۆی دوواکەوتنی باوکم لە گەڕانەوە بۆ ماڵ لە کاتی چاوەڕوانکراوی خۆیدا نیگەرانیەکی قورس دایکمی داگرتوو پێی گووتم " ئۆفیلیا باوکت دەبوایە سەعات شەش بگەڕێتەوە کەچی وابوو بە حەوت هێشتا دیار نیە، بۆ بە ڕاکردن ناچیت بزانیت بۆ دیار نیيە؟". دایکم قسەکەی تەواو کرد و من بە پڕتاو پاڵتۆ خوریە ئەستوورەکەم کردە بەرم، ئەو پاڵتۆیەی لە فەرووی وورچەکانی تەوەرەی باکوور دروستکرابوو. لە ماڵ هاتمە دەرێ و بە نیگەرانیەوە پێمنایە کۆڵان. تا زیاتر لە دوکانەکە نزیکتر دەکەوتمەوە

بۆنی عەترەکە قورستر دەبوو، بەڕادەیەک وایلێهات ئەو دەمەی گەیشتمە بەر دوکانەکەی باوکم بە تەواوی هەناسەم گیرا. دوکانەکەی باوکم تاڕادەیەک بچووک بو و زیاتر کارخانەیەکی خنجیلەی عەتر دروستکردن بوو نەک دوکان. من نەمدەزانی بەهۆی نەرمە غارەکەمەوە بوو یاخود بە هۆی ئەو بۆنە توند و نائاساییەی عەتری ناو دوکانەکەی بابم بوو بەتەواوی هەناسەم بۆ نەدەدرا. پێش ئەوەی بە تەواوی پێ بنێمە ناو دوکانەکەوە بە دەنگێکی پڕ لە دوودڵی و لەژێر کاریگەری ئەو ترسەی بۆنی تیژی عەترەکە و دیارنەبوونی باوکم لای دروستکردبووم بانگم کرد "بابە، هۆ بابە" بەڵام هیچ وەڵامێک نەبوو. ئیتر لەو کاتەدا چوومە ناو دوکانەکەوە و بینیم باوکم بە گیانێکی شەلاڵ لە خوێن و مل و سنگ و سکێکی هەڵدڕاوەوە بەسەر دنیایەک وردە شووشەی شکاوی عەترو کەمووڵەی پڕ لە گەلاوگوڵی ڕژاودا کەوتووە. بۆ ساتێک بە بێدەنگی و بە دەمێکی کراوەوە سەیرم کرد و زمانم لە دەمما بو بە پەلاس. لەو کاتەدا تەنیا ڕوناکی ناو دوکانەکە مۆمێکی کز بوو کە باوکم لە ژنە هیندیەکەی بەرامبەر ماڵی خۆمان دەیکڕی. گڕی مۆمەکە بە تەواوی دەموچاوی باوکمی ڕوناک کردبۆوە و من شوشەی شکاوی ڤۆدگا و ویسکی بە خوێنم بینی لە تەنیشت باوکمەوە کەوتبوون. تاکە کاردانەوەیەکی من لەو ئێوارەیەدا هاوارێکی بەرز بوو، ئەو

هاوارە دواهاوار و دوادەنگی من بوو. بە زمانێکی شکاو و ڕەنگێکی پەڕیوەوە، بە ڕاکردنێکەوە کتومت لە ڕاکردنی یاریکەرەکانی گۆڕەپانومەیدان دەچوو نەک ڕاکردنی کچێکی هەژدەسالان کە هەموو ژیانی خۆی لە نێوان ماڵ و قوتابخانە و دوکانەکەی باوکیدا بەسەر بردبێت، بەرەو ماڵەوە ڕامکرد. بە دەمووچاوێکی شپرزەوە خۆم کرد بە ماڵدا و بە نیگایەکی تاساوەوە سەیری دایکمم کرد و بە دەستی ڕاستم ئاماژەم بۆ لای دوکانەکەی باوکم کرد و ئیتر دایکم چاوەڕوانی هیچی تری لێنەکردم و تێگەیشت کارەساتێک ڕوویداوە. ئێستا من کە بیر لەو ڕۆژە دەکەمەوە لە خۆم دەپرسم باشە دەبێت دایکم لەو کاتەدا خەیاڵی بۆ چی شتێک چووبێت؟. دیارە دایکم بە هەستی ژنانەی خۆی زانیویەتی مێردەکەی شتێکی لێبەسەر هاتووە. ڕەنگە دایکم خەیاڵی بۆ ئەوە چووبێت باوکم سەیارە لێی دابێت یان کارەبا گرتبێتی بەڵام دڵنیام قەت خەیاڵی بۆ ئەوە نەچووە کە چەند پەتیارەیەک مێردەکەی بەو بێڕەحمیە بکوژن. دایکم ڕایکرد و خواردن و خواردنەوەی ئەو ئێوارەیەی لە سەر مێزی نانخواردنەکە بەجێهێشت و منیش بە دوای ئەودا ڕامکرد و هیچمان هۆشمان لەوە نەبوو دەرگاکەی حەوشە لە دوای خۆمانەوە دابخەین.

لەو ئێوارەیە بە دوواوە ئیتر من کچێکی لاڵ بووم. ئیتر من زمانم گیراو ئەو زمان گیرانەش بەدرێژایی ژیانم لە گەڵما مایەوە. دیارە

دایکم، پوورە ڕێبیکام، دراوسێکانیشمان و تەنانەت خۆیشم یەکەم ڕۆژو دووەم ڕۆژ زمان لاڵ بوونەکەم وەک مەسەلەیەکی زۆر نائاسایی وەرنەگرت و وامان لێکدایەوە کە ئەوە ئەنجامێکی تاڕادەیەک چاوەڕوانکراوە بۆ کچێکی گەنجی دنیانەدیدە لە کاتێکدا بەسەر مەرگی ناوادەی ئازیزێکیدا بکەوێت. بەڵام لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژان و مانگان و ساڵان ئیتر هەمووومان تێگەیشتین ئیتر جارێکیتر من قسەم بۆ ناکرێتەوە و ئەوەش پێدەچوو میلیاس لە هەمووان زیاتر عەزیەت بدات بەڵام ئەو وەک سروشتی هێمن و ئارامی خۆی هەرگیز ئەو مەسەلەیەی بەسەر خۆی نەهێنا.

پوورە ڕێبیکام و مێردەکەی هەوڵیاندا من ڕازی بکەن تەلەفۆن بۆ کوڕەکەیان بکەم و هەواڵی مردنی بابمی پێ بڵێم. دیارە ئەوان جگە لەوەی دەیانەویست بە هۆی نزیکی منەوە لە میلیاس ئەو ئەرکەم پێ بسپێرن، مەبەستیشیان بوو هەر بەڕاستی دڵنیا بن لەوەی ئیتر من تواناى قسەکردنم هەیە یان نا. من چەند جارێک لەبەرچاوی ئەوان تەلەفۆنەکەم هەڵگرت و ژمارەی ئەو خانەیەم لێدا کە ساڵانێک بوو میلیاس لەوێندەر دەژیا. ئەو کاتەی زەنگەکە لێیداو ژنێک تەلەفۆنەکەی هەڵگرت من بە لاڵە پەتێوە بڵمەبڵمێکم کردو هەرچەندم کرد ئەو دەنگانەی لە دەممەوە دەهاتنە دەرێ نەمتوانی بیانکەم بە وشە و ڕستە. بۆیە عەرەقێکی ساردم کردو تەلەفۆنەکەم دانایەوە و

ئەوەش هەمان کات بوو خانی و پوورە ڕێبیکاو دایکم سەیرێکی یەکتریان کردو بە نیگا یەکتریان تێگەیاند کە من لە دۆخێکی باشدا نیم  و ناچار پوورە ڕێبیکام ڕووی کردە مێردەکەی و پێیگووت" خانی وا باشترە خۆت کاتێکی تر تەلەفۆنی بۆ بکەیت و ئاگاداری بکەیت".

ساڵانێک دوای ئەو ڕۆژە بابی میلیاس بۆی باس کردم کاتێک ئەو هەواڵەکەی بە میلیاس  ڕاگەیاندبوو، میلیاس هیچ سەرسوڕمانی پیشان نەدابو و کاردانەوەکەی بەشێوەیەک ببوو وەک ئەوەی چاوەڕوانی هەواڵێکی لەو جۆرەی کردبێت.

پێنج ڕۆژ بوو تەرمی باوکم لە بنکەی بەڕێوەبەرایەتی کاروباری ماتەمینی گەڕەک بوو، لەو پێنج ڕۆژەدا مێردی پوورەکەم بەسەر جێبەجێکردنی سەرجەم تەداروکاتی ماتەمینیەکە ڕاگەیشتبوو. یەکێک لە کارمەندانی بەڕێوەبەرایەتیەکە پیاوێکی ئایرلەندی بوو و هەمیشە ئەو کاتانەی قسەی دەکرد خەیاڵی بۆ شوێنێکی تر دەڕۆیشت و سەیری خاڵێکی نادیاری دوور و وەهمیی دەکرد لە ناو فەزادا، ڕاسپێردرابوو بچێت بۆ لای دارتاشێک و سەرپەرشتی دروستکردنی تابووتێک بکات. خەڵکی گەڕەک دەیانگووت  ئەو پیاوە ساڵانێک لە گرووپێکی نهێنی جەنگاوەرە ئایرلەندیەکاندا جەنگاوە. ئەو پیاوە

دوای ئەوەی یەکێک لە هاوڕێکانی لە دەمەقاڵەیەکدا لەسەر ئەوەی گوایە عیسا کاسۆلیک بووە یان پرۆتستانت تووڕە بووە و فیشەکێکی ناوە بە کەللەی سە ری خۆیەوە و مردووە، ئیتر ئەویش دڵی زۆر دەڕەنجێت و بۆ یەکجاری ئایرلەندا جێدەهێڵێت . دوواتر لەو شارەی ئێمەدا وەک پیاوێکی بێدەنگ و خەفەتبار لە بنکەی جێبەجێکردنی کاری پرسەوماتەمینی دەستبەکار دەبێت و ئەرکی سەرپەرشتیکردنی دروستکردنی تابووتی مردووەکانی پێدەسپێرن. دیسانەوە هەر بابی میلیاس پەرژابۆ سەر دیاریکردن و ئامادەکردنی ئەو شوێنەی بڕیار بوو بابمی لێبنێژن و سەردانی کڵێسای سانت ماریای کردبو و لەگەڵ قەشەیەکدا قسەی کردبوو بۆ ئەوەی ئامادەی ڕێورەسمی ناشتنی باوکم بێت.

ئەو قەشەیەی لە ناشتنی بابم ئامادە بوو کوڕێکی لاو بوو بە قژێکی خاوی برۆنزیەوە و دەموچاوێکی پاک و بێگوناهو سادەوە دەتگوت دەمووچاوی ئەو منالانەیە کە تازە فێری پایسکیل لێخوڕین دەبن. ئەو لەو قەشانە بوو ئەگەر لە جێگایەکدا بیبینیت و لە جیاتی جلی قەشەکان چاکەت و پانتۆڵی لەبەردابێت وای بۆ دەچیت کە ئەوە مامۆستای مۆسیقا بێت لە یەکێک لە قوتابخانە سەرەتاییەکان، یان یەکێک بێت لەو کەسانەی  لە خۆپیشاندانێکدا بەشداری دەکەن دژی ئەو جوتیارە وێڵزیانەی شەو و ڕۆژ ڕاوی ڕێوی دەکەن. باوکی

میلیاس ئەو کاتەی داوای لە قەشەکە کردبوو بۆ ئەوەی بێت و نوێژی ماڵئاوایی لە سەر جەنازەی ژنبراکەی بخوێنێت، قەشەکە کەمێک بەشەرمەوە هەر تەنیا بۆ ئەوەی قسەیەک بکات پرسیبووی "بۆ ئەو پیاوەی لە گوڵی کێوی عەتر و داوودەرمانی دروست دە کرد کورد بوو؟" خانیش وەڵامی دابۆوە و پێی گوتبوو "جەنابی قەشەی لاو نەخێر ئەو ئینگلیز بو و هەروەها برای ژنەکەی من بو و ناوی هێربێرت بوو، بەڵام بۆ ئەوەی کەسێک خوشکەکەی ژنی من بێت هیچ پێویست ناکات خۆی کورد بێت". ئەو دەمەی خانی ئەو قسەیەی کردبوو قەشەکە سوور هەڵگەڕابو و لە دووای ئەو ڕۆژەوە قەشەی لاو چەند جارێک بە بیر بابی میلیاسی هێنابۆوە کە ئەو هیچ مەبەستێکی خراپی نەبووە لەو قسەیەو خۆشی نازانێت بۆچی بۆ ئەوەی پیشانی بدات دەمودووی قسەکردنی هەیە ئەو پرسیارەی هاتۆتە سەر زمان. بابی میلیاسیش دڵنیای کردبۆوە لەوەی ئەویش بە ڕقەوە وەڵامی نەداوەتەوە بەڵکو وەڵامەکەی یەکێک بووە لەو سوعبەتە تاڵانەی جاروبار تازیەبارەکان دەیکەن. ئیتر لەو ڕۆژە بە دوواوە من زۆر جار قەشەی لاوم دەبینی ئێواران لەگەڵ بابی میلیاسدا لە حەوشەکەیان دادەنیشتن و باسی یەکێک لە سەرگوزەشتەکانی ناو 'کتێبی پیرۆز'یان دەکرد، ئەوەی چۆن هیرۆدۆتس ئەو کاتەی پیاوەکانی وڵاتی فارس خەونەکانیان

دەگێڕنەوە ئەو دەست دەکات بە کوشتنی منداڵەکانی بەیتلەحم و بەیتجالا، هەروەها باسی فرانسیسی ئاسیزیشیان دەکرد ئەو کاتەی وەک گەدایەک، یاخود وەک مەسیحێکی هەژار گوند بە گوند گەڕاوە و بە خەڵکی ڕاگەیاندووە زۆر دڵبەستەی دنیا نەبن.

بیرم دێت لە یەکێک لەو ئێوارانەدا پوورە ڕێبیکام نەخۆش بو و من بۆ هەندێک ئیشوکاری ناوماڵ هاوکاریم دەکرد، گوێم لێبوو بابی میلیاس باسی سۆفیگەرە موسوڵمانەکانی بۆ قەشەی لاو دەکرد، شیعرەکانی چەند شاعیرێکی بە عەشقێکی زۆرەوە بۆ دەخوێندەوە. من ساڵانێک دوواتر زانیم ئەو شاعیرانە فەریدەددینی عەتارو مەولانای ڕۆمی و حافیز و سەعدی شیرازی بوون و هەوڵێکی زۆری دەدا بە شێوەیەک شیعرەکان وەربگێڕێت بۆ سەر زمانی ئینگلیزی کە هەمان گەرم و گوڕی شیعرەکە و ئەو قووڵیەی لە ماناکانیدا هەیە وون نەبێت. ئێستاش ئەو دێڕە شیعرەی سەعدی شیرازیم هەر لە یادە مێردی پوورەکەم بۆ قەشەی لاوی شیدەکردەوە و دیار بوو زۆر سەرنجی قەشەی ڕاکێشابوو. دێڕە شیعرەکە لەبنەڕەتدا سەعدی بە عەرەبی نووسیبووی و من ساڵانێک دوواتر کاتێک میلیاس سەردانی ئێرانی کرد داوام لێکرد دەقی ئەو دێڕە شیعرەم بۆ بدۆزێتەوە. چەندم پێ جووان بوو ئەگەر هەڵەم نەکردبێت ماناکەی وایلێدە هات : ئەگەر لە ڕۆژی ماڵئاواییکردن لە

تۆ من نەمردم، ئەوا تۆ لە ڕیزی دۆستانی بە ئینسافدا حیسابم مەکە. بابی میلیاس ئەو دەمەی ئەو دێڕەی دەگووت بە گۆڕانی دەنگیدا دەزانرا گریان لە قوڕگیدا پەنگی خواردۆتەوە.

لە یەکێک لەو ئێوارانەی باوکی میلیاس و قەشەی‌لاو بە یەکەوە دادەنیشتن و گفتوگۆیان دەکرد، قەشەی لاو کتێبێکی بچووکی پیشانی مێردی پورەکەمدا. ئەو کتێبە چوارینەکانی خەیام بوو بە ئینگلیزی و لە وەرگێڕانی ئێدوارد فیتزجیراڵد بوو. گوێم لێبوو قەشەی لاو دەیگووت گوایە ئەو کتێبە لە ساڵی ١٩٤٣دا لە گەرمەی جەنگی جیهانی دووەمدا یەکێک لە دەستە خوشکەکانی نەنکی بە دیاری داویەتی پێی و نەنکیشی وەک دیاریەکی بەنرخ لە هاوڕێییەکیەوە پاراستوویەتی. بە قسەی قەشەکە بێت نەنکی ئەو کتێبەی لە گەڵ خۆیدا بردۆتە ئەو ژێرزەمینانەشەوە کە خەڵکی بەریتانیا لەو کاتەدا لە ترسی تەیارەو تۆپبارانی ئەڵمانەکان خۆیان تێدا شاردۆتەوە. قەشەکە دەیگووت نەنکی لە ڕۆژژمێرە بچووکەکەی خۆیدا نووسیویەتی " دەبێت هیتلەر و ڕایخی سێیەمیش بەو داخەوە سەربنێنەوە ئەگەر بیانەوێت ئێمە وێران بکەن. ئەمڕۆ ئەوان بە تەیارە و تۆپ کەنیسە و کتێبخانەکان دەسووتێنن، منیش لە ناو پەناگەکەی گەڕەکی خۆماندا وەک تەحەددایەک خەیام دەخوێنمەوە". بابی میلیاس سەری بەسەر کتێبە بچووکەکەدا شۆڕدەکردەوە و

دەگریا. بینیم لە لاپەڕەی یەکەمی کتێبەکە بە دەست و خەتێکی کچانە و بە ڕەنگی پەمەیی نووسرابوو" لە جۆیسەوە پێشکەشە بە ئێزمی، دیسەمبەری ١٩٤٣ ". من ساڵانێک دوواتر زانیم گریانی باوکی میلیاس پەیوەندی بە چوارینەکانی خەیامەوە نەبووە، بەڵکو پەیوەندی بەو چیرۆکەی ناو کتێبی پیرۆزەوە هەبووە، ئەو بەسەرهاتەی باسی خەونی پیاوەکانی وولاتی فارس دەکات دەربارەی لە دایک بوونی عیسا و قەشە لاوەکە زۆر مەیلی لە باسکردنی ئەو چیرۆکە بوو.

بابی میلیاس ویستبووی بەیانیەکی زوو تەلەفۆن بۆ میلیاسی کوڕی بکات، بەڵام دوواتر بیری دەکەوێتەوە میلیاس ڕۆژانی شەممان و یەکشەممان بەیانیان تا درەنگ لە ناو جێگادا دەمێنێتەوە، ئەوەش وایلێکردبوو تەلەفۆنکردنەکەی دوواخستبوو بۆ دوای نیوەڕۆ. ئەو دوانیوەڕۆیەکی درەنگ تەلەفۆن بۆ میلیاس دەکات و ژنێک لە پرسگەی ئاپارتمانەکە وەڵام دەداتەوە. باوکی میلیاس گوتی ژنێکی دەنگ نێر وەڵامی داوەتەوە و زۆر هەوڵیداوە بە ناز قسە بکات ئیتر من یەکسەر زانیم ئەو پیرێژنەی خاوەنی ئەپارتمانەکەیە. ئەو ژنە مووەکانی سەری تەنک ببوو بەڕادەیەک پێستی سەری لە ژێر تاڵە مووە تاکوتەراکاندا دەبریسکایەوە و سوراوێکی تۆخی لێوە چرچەکانی دەکرد. بە ڕێگادا دەڕۆیشت و دەیویست وای نیشانبدات

تەمەن نەیتوانیوە تەڕوبڕیەکەی سەردەمی گەنجی لێبستێنێتەوە، بەڵام ڕۆیشتنەکەی نەک هەر لە ژنێکی شۆخ نەدەچوو بەڵکو کتومت لە گامێشێکی نەخۆش دەچوو کە خاوەنێکی بێڕەحم لێیخوڕێت. سەرەڕای هەموو ئەوانەش من عەقڵم نایگرێت ئەو ژنە بە گەنجییش جوان بووبێت. ئەو دەمەی قسەی لەگەڵ پیاواندا دەکرد بە چاوێکی حیزەوە سەیری دەکردن و  بە هەر بیانوویەکەوە بووایە دەستی لە دەستیان دەدا گوایە خۆش مەشرەبەو خەڵکی خۆشدەوێت و لە ناو قسەکانیدا چەندان جار دەیگووت" تێدەگەی دەڵێم چی؟".  میلیاس جارێکیان بۆی باس کردم چۆن ئەو پیرێژنە زۆر جار بە پارە و دیاری گرانبەها کوڕانی گەنج ڕازی دەکات لە گەڵی بڕۆنە ناو جێگاو شەوی لەگەڵ ڕۆژ بکەنەوە.

ئەو ڕۆژەی باوکی میلیاس خۆی بە پیرێژن دەناسێنێتو پێی دەڵێت ئەو باوکی میلیاسەو دەیەوێت قسە لەگەڵ کوڕەکەی بکات، پیرێژن بۆ ساتێک دوودڵ دەبێت چونکە بۆ ماوەی ئەو سێ ساڵەی میلیاس لەو ئاپارتمانەدا بردبوویە سەر هیچ کەسێک تەلەفۆنی بۆ نەکردبوو. لەوەش واوەتر کاتی خۆی بۆ یەکەمجار کە میلیاس خۆی لەوێ ناونووس کردبو و ژورێکی لەگەڵ هاوپۆلێکی خۆیدا بەکرێ گرتبوو تا ئەو چەند ساڵەی لە بێلفاست لەزانکۆ دەبێت تیایدا گوزەران بکات و بۆ ئەوەی سەرنجی پیرێژنەکە لەسەر خۆی دووربخاتەوە،

هاوڕێکانی ڕاسپاردبوو بە پیرێژن بڵێن  میلیاس دایکو باوکی نیەو هیچ حەوسەڵەی نیە قسە لەگەڵ کەس بکات. میلیاس بۆی باس کردم چۆن برادەرەکانیشی هەمان بیرۆکەیان خستبۆ مێشکیەوە بەو پێیەی ئەوانساڵێک پێشتر لەوێ ببوونو شارەزای هەڵسوکەتی پیرێژنەکە ببوون. ئەوەی میلیاس و برادەرەکانیشی ناچار کردبوو هۆگری ئەو شوێنە بن خۆشی شوێنەکەو عیشوەو نازی پیرێژن نەبوو بەڵکو زۆر بە سادەیی هەرزانی شوێنەکە بوو.

"باوکی میلیاس؟" پیرێژنەکە بەسەر سوڕمانەوە پرسیبووی و وای پیشان دابوو بڕوای نەکردووە، بەڵام بەناڕازیبوونەوە وتبووی میلیاس ئێستا لەژوورەکەی خۆیەتیو بووەستە بانگی دەکەم. میلیاس هەر جارێک ئەو ڕۆژەی بۆ باسدەکردم بە نەرمە پێکەنینێکەوە کە تایبەت بەخۆی بو و من بە هەموو ژیانم کەسێکی ترم نەبینی بەو  شێوەیە نازدارو میهرەبان پێبکەنێت. میلیاس باسی ئەوەشی بۆ کردم کاتێک بە جلی ناوماڵەوە لە ژوورەکەی خۆیەوە دێت بۆ نووسینگەی پیرێژنەکە، پیرێژن سەیری ئەو بەشەی لەشی میلیاسی کردووە کە دەکەوێتە خوار ناوکیەوە. ئینجا میلیاسە شەرمنەکەی من تەریق ببۆوە.

من ئێستا لەم بنکەیەی گووایە بۆ نەهێشتنی خەمۆکی کەسانی وەک من بنیادنراوە ئەم چیرۆکە دەنووسمەوە. مەبەستم لە نووسینەوەی ئەو چیرۆکە ئەوەیە لەبنەڕەتدا دەمەوێت باسی میلیاستان بۆ بکەم، باسی تاقانە کوڕەکەی پوورە ڕێبیکام و خانی مێردی. بەڵام بە ناچار باسکردنی میلیاس دەمباتە سەر هەموو ئەو شتانەی ڕۆژێک لە ڕۆژان پەیوەندیان بەوەوە هەبووە، باسکردنی ئەو شتانەی ڕۆژێک لە ڕۆژان بە یەکەوە پێی پێکەنیوین، شەوێک لە شەوان بەدیاریەوە گریاوین، بەچاکو بەخراپ هاتوونەتە ناوژیانی ئەوەوە و وەک پارچەکانی موزایک هەر پارچەیەی لە شوێنێکەوە چیرۆکی ژیانی کورتو پڕ ئەزموونی ئەو تەواو دەکەن. میلیاس کوڕێک بوو من هەمیشە ویستوومە هی من بێت و هەرگیز نەبوو بەهی من. کوڕێک بوو خوواوەندەکان بۆ سەفەرێکی کورتی بیستوپێنج ساڵە ناردیانە سەر زەوی و هەرزوو بانگیانکردەوە. بۆ ئەوە ناردیان تا شوێنپێی چەند کەسێک هەڵبگرێت کە جەنگ و دەربەدەری و مەرگ وەک مار ئاڵایە چارەنووسیان. ئەگەر میلیاس نەبووایە هیچ کەسێک نەیدەتوانی ڕۆحی من هێور بکاتەوە، ئەو ڕۆحەی بە هۆی مەرگی بابمەوە وەک بورکانێک لە ناوەوە دەیسوتاندم. بابم پیاوێک بوو لە گوڵی کێوی عەترو داوودەرمانی دروست دەکرد. ئەگەر گەشتە سیندیبادیەکانی میلیاس نەبووایە ئێستا من بە تەواوی نەمدەزانی

خانی کێبوو. هەر میلیاس نەبوو سەردانی شاری مەشهەدی کرد و خوسرەوی ڕازیکرد ڕابردوو بخوێنێتەوە؟. ئەگەر هۆگریی ئیلیا بە میلیاسەوە نەبووایە ئێستا من هیچ شتێکی گرنگم نەبوو لە سەر ئیلیا بینووسمەوە. میلیاس نەبووایە ئێمە ئێستا زۆر شتمان لە سەر لاس نەدەزانی، وە لە سەرووی هەمووشیەوە دەستنووسێک ڕزگاری نەدەبوو، ئەو دەستنووسەی زیاتر لە سێ سەدە بوو گروپێک بە دوایدا دەگەڕان تا وەک سەدان دەستنووسی تر بیسووتێنن. لە ڕاستیدا من هەر کاتێک بیر لەو دەستنووسە دەکەمەوە، ڕۆڵی میلیاسم گرنگتر دێتە بەرچاو لە هی لاس. من نامەوێت بڵێم بە بێ بوونی لاس دەستنووسەکە ڕزگاری دەبوو، نا من قەت واناڵێم بەڵام ئەگەر میلیاس نەبایە کەس نازانێت ڕزگارکردنی ئەو دەستنووسە چەند سەدەی تر دوادەکەوت، ئەوە ئەگەر لە لایەن 'خەنجەرەکانی نیوەشەو' ەوە نەدۆزرابایەوە و نەسووتێنرابایە.

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

# هەڵۆیەکی زل باوکم دەڕفێنێت

شەوێک بەر لە کوژرانی باوکم میلیاس خەونێکی سەیری بینیبوو. هەر ئەوەش بوو وایلێکردبوو چاوەڕوانی هەواڵێکی ناخۆش بکات بۆیە ئەو دەمەی مێردی پوورە ڕێبیکاشم پێی گوتبوو خاڵت لە دووکانەکەی خۆیدا کوژراوە، ئەو هیچ قسەیەکی نەکردبوو. لەخەونەکەیدا لەگەڵ بابم لە دەشتێکی فراواندا دەبن، بابم باقەیەکی زۆر گەورە لە گوڵی کێوی لە باوەشدا دەبێت، لەپڕ لەلای ئاسۆی باکوورەوە بە بەرزیەکی زۆرەوە دەنگی قریشکەیەکی سامناکیان دێتە گوێ. وردە وردە قریشکەکە لێیان نزیک دەبێتەوە، بەڵام بابم هەر وەک ئەوەی گوێی لە دەنگە سامناکەکە نەبێت خۆی لە گوڵچنین ناکات. دووای کەمێک  سێبەری هەڵۆیەکی یەکجار زل دەکەوێتە سەریان. هەڵۆکە بە ئەندازەیەک گەورەیە هەر لە باڵداری خورافی ناو حیکایەتەکان دەچێت و سێبەرەکەی هەموو دەشتەکە دادەگرێت. باڵدارە زەبەللاحەکە لە جیاتی دوو چنگ چوار چنگی هەیە، بە سێ چنگیان سێ پیاوی هەڵگرتووەو لەزەوی نزیک دەبێتەوە، بە چنگی چوارەمی باوکم هەڵدەگرێت و دەیفڕێنێت و ئیتر باڵدارەکە لە ناو تەم و هەور و دوکەڵێکی سووردا وون دەبێت. میلیاس  بە دەنگێکی

بەرز هاوار دەکات 'خاااااڵە اااااااااااااا' و ئیتر لەو کاتەدا ئەوکوڕەی لەهەمان ژوورەکەی میلیاسدا دەبێت دەست دەخاتە سەر شانی میلیاس و بانگی دەکات "میلیاس، میلیاس، ئەوە چیتە؟ " ئیتر میلیاس بەخەبەر دێتو ئەو شەوەو چەندان شەوی تریش هەوڵ دەدات ئەوسێ پیاوەی تر کە لە خەونیدا لە چنگی هەڵۆکەدابوون بهێنێتەوە یادی خۆی بەڵام بێسوود دەبێت. میلیاس هەر کاتێک ئەو خەونەی بۆ من دەگێڕایەوە زۆر دڵنیا بوو لەوەی لە خەونەکەدا سێ پیاوەکەی تری ناسیوە بەڵام دووای ئەوەی خەبەری بۆتەوە لە یادی چوونەتەوە کێ بوون.

ئەو کاتەی میلیاس لە تەلەفۆنەکەوە گوێی لە دەنگی مات و خەمباری باوکی ببوو پێی گوتبوو میلیاس چۆنیت، میلیاس پێش ئەوەی وەڵامبداتەوە پرسیبووی 'بابە خاڵم چۆنە؟'، ئیتر خانی شپرزە دەبێت و پێی دەڵێت"کوڕم میلیاس! منیش هەر بۆ ئەوە تەلەفونم کردووە. خاڵت لە ناو دوکانەکەی خۆیدا کوژراوە". میلیاس شتێکیوا ناڵێت ئەوەندە نەبێت بە باوکی ڕادەگەیەنێت سبەی زوو دەگەڕێتەوەو هیچ قسەیەکی دی ناکات، بەڵام کوڕە هاوپۆلەکەی میلیاس، ئەوەی لە ژوورەکەدا بەیەکەوە دەژیان بۆی باسکردم میلیاس ئەو شەوە تا بەیانی لە ژێر جێگاکەوە گریاوە و بۆ بەیانیەکەشی بە شپرزەیی و نیگەرانیەکی لە وەسف بەدەر جانتاو جلو کەلوپەلەکانی

کۆکردۆتەوە بە یەکەم شەمەنەفەری ئەو ڕۆژە گەڕابۆوە شارەکەی خۆمان.

*** *** ***

من و میلیاس لە ساڵێکدا لە دایک بووین. هەمان ئەو ساڵەی بەریتانیاو ئەرجەنتین لە سەر دوورگەیەکی ناوەڕاستی زەریای ئەتڵەسی شەڕیان بوو. بۆ شەڕیان بوو؟ ئەگەر لە من دەپرسن ئەوا دەڵێم نەتەوەی ئێمە کە سەردەمانێک بە داگیرکاری‌و ملهوڕی ئیمپراتۆریایەکمان بنیاد نابوو، ئیمپراتۆریایەک وەک مێژوونووسانمان و کتێبەکانی مێژوو لە قوتابخانە دەڵێن قەت خۆری لێ ئاوا نەدەبوو، بۆمان قووت نەدەچوو میللەتێکی تر لە ئاسمتاندا سەرهەڵبڕێت، میلەتێکی تر بڵێت نا.. بەڵام ئەگەر لە خانمی تاتچەر بپرسن بێگومان وەڵامی ترتان دەست دەکەوێت.

من هەر تەنیا پێنج مانگ لە میلیاس منداڵتر بووم، بۆیە هەر بەیەکیشەوە لە هەمان دایەنگا دایاننناین. بە بیرم نایەت بەڵام دەزانم ئەو ساڵەی ئێمە لە دایەنگا دانراین هەمان ساڵ حکومەتی کۆنزەرڤاتیڤەکان کرێکارانی کانە خەڵووزەکانی ئینگلاندی بە

هەڕەشەو کوتەک نائومێدوچاوترسێن کرد. من و میلیاس بێجگە لە خزمایەتی، بەوەی ئەو کوڕی پورم بو و منیش کچی خاڵی ئەو بووم، زۆر ڕایەڵی تر هەبوو بەیەکەوەی دەبەستین. ئێمە لە هەمان ساڵدا لە دایک ببووین، لە هەمان دایەنگا چاودێری کراین، لەهەمان قوتابخانە خوێندمان، بەیەکەوە یاریمان کرد - قسەکردن فێربووین و گەورەبووین. ئێستاش وادەزانم دوێنێیە ئەو کاتەی باوکم و پوورە ڕێبیکام دەستی من و میلیاسیان گرتبو و دەیانبردین بۆ یەکەم جار لە قوتابخانە ناونوسمان بکەن، ئەو قوتابخانەیە هەمان شوێن بوو ساڵانێک دوواتر کردیان بە خانەیەک بۆ چاودێریکردنی ئەو ژن و پیاوە پیرانەی لەسەرەمەرگدان. میلیاس کراسێکی کەتانی سپیو چاکەتێکی مەخمەڵی قەزوانی لەبەر بوو، قژی بەشێوەیەک داهێنرابوو ڕێک لە مووەکانی پشتی گوێرەکەیەک دەچوو کە دایکی بە زمان لێسابێتیەوە. منیش عەزیەکی نیللیم لەبەرابو و دایکم قژمی کردبو بە پرچو وەک دوو گوێی کەروێشکێک بەملاوئەولای سەرما هاتبوونە خوار. مامۆستاکە ژنێکی کامڵ بوو لە میلیاسی پرسی ناوت چیە، میلیاس بە دەنگێکی تێکەڵ بەشەرم و زمانێکی پس و نیگایەکی سادەی منداڵانەوە گوتی من ناوم میلیاثە، ئینجا ڕووی کردە من و دەستی بەرەو من ڕاکێشاو گوتی ئەوەش ناوی ئۆفیلیایە. ئیتر مامۆستاکە و باوکم و دایکی میلیاس هەموویان

پێکەنین، منیش سەیرێکی باوکمم کردو پەنجەتوتەی دەستی ڕاستم خستە دەممەوە. بۆ خۆشم نازانم بۆچی خەریک بوو بگریم بەڵام پەشیمان بوومەوە و پێدەچوو هۆیەکی بەهێزم شک نەبردبێت تا بگریم بۆیە بە بێئەوەی بزانم مەسەلە چیە پێکەنیم.

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

ناشتنی بابم لە ڕێوڕەسمێکی تاڕادەیەک هەژارانەدا ئەنجام درا. ئەو ڕیوڕەسمە هەرگیز شایستەی پیاوێک نەبو کە هەموو تەمەنی سەرفکرد بۆ ئەوەی گوڵەکێویەکان بکات بە عەترودەرمان - یان وەک خۆی دەیگووت گوڵە کێویەکان ماڵی بکات. باوکم پیاوێک بوو هەموو ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ ئەوەی بتوانێت من و دایکم بەختەوەرکات. من لە دڵەوە باوکم خۆشدەویست و مەرگی ئەو یەکجار نیگەرانی کردم. بە هۆی مەرگی ئەوەوە من لاڵ بووم، بەڵام قەت هەستم نەکردووە کاردانەوەیەکی ناسروشتیم نواندبێت. ئەی نەدەبووایە کاردانەوەیەکم هەبێت؟ ئەی نەدەبووایە پیشانیبدەم بۆ هەتا هەتایە کەسێکی بە نرخم لە دەست چوو؟

من و دایکم و میلیاس و باوک و دایکی میلیاس و پیاوە هیندیەکە و ئیلیا و قەشەی لاو و سێ چوار کەسی تر کە من نەمدەناسین، ئەوانە هەموو ئەو کەسانە بوون لە ناشتنەکە ئامادە بووین. ئەو ڕۆژە میلیاس قاتێکی ڕەشی لەبەردابو و لەتەنیشت باوکیەوە وەستابوو، دوای ئەوەی تابووتەکەمان خستە گۆڕەکەوە و بەو خۆڵ و گڵەی لەوێ بوو دامانپۆشی و هەرکەسە مشتێک خۆڵی کردە سەر، قەشەی لاو نوێژی مردووی خوێندو هەمووان بەرەو ماڵ بووینەوە. من دەمزانی میلیاس چەند بۆ باوکم بەپەرۆشە بۆیە چاوەڕێی ئەوە نەبووم ئەو دڵنەوایی من بکات. نەک هەر ئەوە بەڵکو بە ئەندازەیەک لە باوکمەوە نزیک بوو کە هەر بەڕاستی ئەویش پێویستی بە دڵنەواییکردن هەبوو. میلیاس لێم نزیک بۆوەو بە دەنگێکی هێواش و جەنازەیی پێیگوتم "ئۆفیلیا تۆ دەزانیت من چەند بەداخم بۆ مەرگی خاڵم؟!". بەڵام میلیاس قسەشی نەکردبایە من دەمزانی. ئەو دەمانەی خەمبار دەبوو ڕەنگی چاوانی لە سەوزێکی تۆخەوە دەگۆڕا بۆ ڕەنگی ئەو ئاگردانە خامۆشانەی بەسەر خۆڵەمێشیەکی کاڵدا دەڕوانن. جووڵەی دەستەکانی و تۆنی دەنگی وەک هی ئەو کەسانەی لێدەهات کە ماددە بێهۆشکەرەکان داغانی کردوون.

ئەو دەمەی میلیاس ئەوقسەیەی کرد چاوەڕوانی ئەوە بوو منیش قسەیەک بکەم، بەڵام من نە ئەو ڕۆژە و نە هیچ ڕۆژێکی تری ژیانم قسەم بۆ نەکرا.

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

من و دایکم ڕامانکرد و ڕۆیشتینە ناو دوکانەکەی باوکمەوە. یەکەم شت کە دایکم کردی ئەوە بوو هەوڵیدا گڵۆپی ناو دوکانەکە دابگیرسێنێت بەڵام هیچ گڵۆپێک نەمابوو، دیاربوو ئەو کەسانەی باوکمیان کوشتبوو گڵۆپەکانیشیان شکاندبوو. مۆمێک لەسەر تاقی ژوورەکە بوو بە مەحزونی دەسووتا. بابم بە ڕۆژیش حەزیدەکرد مۆمێک لە نزیکیەوە بە بەردەوامی بسووتێت ئەوەش شتێک بوو لە سەرەتای گەنجێتیەوە خووی پێوە گرتبوو. ڕۆشنایی مۆمەکە بەس بوو بۆ ئەوەی ئێمە هەموو شتێک بە ڕوونی ببینین. تەرمی خوێناوی بابم لەناو دنیایەک ووردە شووشە و کەمووڵەی ڕژاوی ئاو و شووشەی بچووک و گەورەی پڕ عەتر و دەرماندا بە شکۆی کوڕە میرێکی کوژراو کەوتبوو. یەک مەنجەڵی گەورەی پڕ لە گوڵی دەمەشێر قوڵپ ببۆوە بەسەر سنگی بابمدا کە زامەکانی سەر سینگی بابم بەهۆی ئەو هەموو گوڵەوە شاهانەتر دەینواند. پیاوکوژەکان

پەلاماری باوکمیان دابو و ئێمە بە شێوەی پچڕانی قۆپچەکانی کراسەکەی باوکم و ڕووشانی دەستومەچەک و دەموچاوی بۆمان دەرکەوت باوکم ویستوویەتی خۆی لە دەستیان ڕابپسکێنێت. لەو مرخێش مرخێش‌و بگرەو بەردەیەدا یەکێک لە تاوانکارەکان، وەک دوواتر لە بەردەمی دادوەری لێکۆڵینەوەدا باسی کرد، بتڵێکی پتەوی ڤۆدگا بە مێزە ئاسنەکەی ناو دووکانەکەدا دەکێشێت‌و ئەو پاشماوەیەی بتڵە شکاوەکە کە بەدەستیەوە دەمێنێتەوە بە هەموو ئەو هێزەی کوڕێکی حەڤدەساڵی سەرخۆش هەیەتی دەیدا لە قوڕگی بابم. بەهۆی ئەو زەبرەوە باوکم بەسەر سنووقێکی گەورەی پڕ لە گوڵی ئەشرەفی و لالۆعەباسیدا دەکەوێت و ئەمەش ئەو گوڵانە بوون باوکم هەمیشە تێکەڵی دەکردن بۆ ئەوەی بە تایبەت ئەو عەترانەی لێ دروستبکات کە دەستگیرانەکان‌و کوڕان وکچانی گەنج لە ڕۆژی ڤالانتایندا بە دیاری دەیاندا بەیەکدی. کەسەکەی تریش بە هەمان دەستوور بە بتڵێکی شکاو دوو زامی گەورە لە سەر سینەی باوکم دەکات. قاچی ڕاستی باوکم کەوتبۆ ناو باقەیەک لاولاو و ئەو خوێنەی لەگەرو و ملیەوە هاتبوو بە تەواوی ڕەنگی ئەو گوڵەهێرۆ سپییانەی ئەرخەوانی کردبوو کە لە تەنیشتیەوە لە ناو سەبەتەیەکی پەلدا بوون. باوکم بە کوژراوی هەر ڕێک لە مەسیحی چوارمێخەکێشراو دەچوو لە یەکێک لە تابلۆکانی ئەندریە مانتێگنادا.

لەو ئێوارەیەدا، لەو کاتەی دوو کوڕی سەرخۆش گەڕ بە باوکم دەکەن، گاڵتەی پێدەکەن‌و پێی دەڵێن "لە گوڵی کێوی عەتر و داوودەرمان دروست دەکەیت؟ هێی دیارە لە سەدەی پانزەدا دەژیت". هیچ کەسێک بە دەرەوە نابێت، هیچ کەسێک ئەو دوو سەرخۆشە نابینێت پیاوە هیندیەکەی دراوسێمان نەبێت. ئەو پیاوە هیندیە ماڵەکەی بەرامبەر ماڵی ئێمە بوو. ئەو لەو کاتەدا لە پەرستگاکەی خۆیان دەگەڕێتەوەو لە کۆڵانەکەی ئەودیو دوو کوڕی گەنج دەبینێت ئەو کاتەی  بەشپرزەیی خۆیان دەکەن بە ماڵێکدا. پیاوە هیندیەکە لە بەر خۆیەوە گوتبوی "دیسان سەرخۆشەکانن!" بەڵام دڵی بۆ هیچ شتێکی زۆر خراپ نەچوبوو، چونکە لەم ڕۆژانەدا بینینی کوڕان و کچانی هەرزەکار بە سەرخۆشی لە کۆڵاندا وەکو بینینی شەمشەمەکوێرەکان لە ئێوارەکانی هاویندا ئاسایی بۆتەوە و کەس سەرسام ناکات. بەڵام  ئەو کاتەی پیاوە هیندیەکە سووڕابۆوە کۆڵانەکەی خۆمان و منی بینیبوو بە خێراییەکی زۆرەوە ڕووەو ماڵی خۆمان ڕادەکەم دڵی ڕاچەنیبوو. ئەو دەیگوت "ئاخر من قەت ئۆفیلیام نەبینیبوو ڕابکات". هاوکات لەگەڵ ئەوەی من و دایکم بە پرتاو لە ماڵ هاتینە دەرو ڕامانکرد بۆ دوکانەکە، پیاوە هیندیەکە لەو سەری کۆڵانەکە بە هەنگاوی خێرای پڕ نیگەرانی و نائارامی دوامانکەوت. دوواتر هەر بەهۆی ئەو زانیاریانەوەی دراوسێ

هیندیەکەمان دای بە پۆلیس، توانرا ئەو دوو کوڕە پەتیارەیە دەستگیر بکرێن، ئەوانەی لە ساتێکی ئەحمەقانەی سەرخۆشیدا منیان لە کچێکی نازداری تاقانەوە گۆڕی بۆ کچێکی لاڵی بێباوک کە ئێستاشی لەگەڵدابێت دیمەنی خەمناکی ئەو ئێوارەیە زەردەخەنەکانم لێڵدەکات. هەر دوای ئێمە پیاوە هیندیەکەش گەیشتە سەر تەرمەکەی باوکم و لە قریشکەو هاواری دایکیشم باوک و دایکی میلیاسیش گەیشتنەجێ. دوواتریش خانی و پیاوە هیندیەکە تەلەفۆنیان بۆ پۆلیس کردو بیست دەقەی پێنەچوو کۆڵان و بەردەمی دوکانەکە بە هۆی لایتی ئەو هەموو سەیارانەی پۆلیسەکان بوو بە چراخان. دایکم و پوورە ڕێبیکام تەرمی خوێناوی بابمیان دەلاواندەوە و بە ناڵە و گریان ئەو ناوەیان پڕ کردبوو. من زمانم شکابو و هەوڵم دەدا بەدەنگی بەرز بگریم، بەڵام وەک ئەوەی کارەساتەکە گەورەتر بێت لەوەی بتوانم بەدەنگ تەعبیری لێبکەم دەنگێکی ڕوونو ئاشکرا وەک دەنگی هەموو ئەو ژنانەی شیوەن دەکەن لە قورگەمەوە نەدەهاتە دەر، بەڵکو دەنگێک دەهاتە دەر کتومت وەک قروسکەی ئەو دێڵە سەگانەی لێدەهات کە تووتکەکانیان زیندەبەچاڵ دەکەن. لە ڕاستیدا من نە دەگریام بەڵکو وەک ئەو دێڵە سەگانە دەمقروسکاند.

پیاوە هیندیەکە هەمیشە بە زەردەخەنەیەکی خاکەڕاییانەوە دەبینرا و هاوڕێیەکی کۆنی باوکم بوو. دەبێت بڵێم هەر لەژێر کاریگەری ئەو

پیاوەدا بوو بابم لە ساڵانێکی زووەوە وازی لەخواردنی گۆشت هێنابوو. هەر جارێک منو میلیاسی دەبینی، بە سوعبەتێکی باوکانەوە پێی دەگووتین" ها گۆشتخۆرەکان کەی بەتەمان سەرو دوو کەڵبەتان لێ بڕوێت؟!"، میلیاسیش بە هەمان تۆنی قسەکانی ئەو و بە ڕەچاوکردنی ئەو خۆشەویستیو ڕێزەی بۆی هەبوو وەڵامی دەدایەوە "ئاخر ئێمە ئەگەر ببینە گیاخۆر دەترسین لە برسا بمرین چونکە خۆت دەزانیت لە چوار وەرزی ساڵدا تەنیا یەک وەرز گیا دەستدەکەوێت". دوای مەرگی بابم بە ماوەیەکی کەم پیاوە هیندیەکە لەگەڵ ژنەکەیدا بۆ یەکجاری گەڕانەوە هیندستان. من تا ئێستاش جاروبار نامەی بۆ دەنووسم و کاتێکیش من و میلیاس چووین بۆ سەردانی، ئەو لە گوندێکی نزیک کەلکەتا دەژیا، میلیاس هەمو ئەو چیرۆکانەی بۆ گێڕایەوە کە پەیوەندیان بە خانی و لاس و ئیلیاوە هەبوو. میلیاس شەوێک ئەوەی بۆ باس کرد چۆن لەگەڵ ئیلیا دووای شەڕی بەلقان چووە بۆ کۆسۆڤۆ و سەردانی هەموو ئەو شوێنانەیان کردووە کە ئیلیا و ئیشماعیلۆڤ زەمانێک پێکەوە تێیدا ژیاون. باسی تراژیدیای ئیشماعیلۆڤی بۆ کرد، ئەو تراژیدیایەی بەشێکی بچووک بوو لە تراژیدیا گەورەکەی  بۆسنەوهیرزۆگۆڤینیا. ڕەشەکوژی منداڵانی شامالای بۆ گێڕایەوە، بۆی باس کرد چۆن سەردانی وڵاتەکەی باوکی کردووە، باسی کوژرانی لاسی بۆ کرد،

باسی ئەوەی بۆ کرد چۆتە سەر گۆڕەکەی لاس، باسی ئەوەی بۆ کرد چۆن خانی پێش ئەوەی بمرێت دەفتەرێکی بۆ میلیاس جیهێشتووەو تەنانەت دەقی ئەو نووسراوەی بۆ خوێندەوە کە باوکی میلیاس نووسیبوی. ئەو شەوەی میلیاس ئەو قسانەی بۆ دەکرد پیاوە هیندیەکە مێزەرەکەی دادەناو چاوەکانی بەئەندازەی چاوەکانی کوندەپەپوویەک دەکرانەوە. کاتێکیش میلیاس گەیشتە سەر باسی گۆڕە بێنازەکەی لاس و باسی ئەوەی بۆ کرد چۆن تەرمەکەی ئیشماعیلۆڤی هاوڕێی ئیلیا بیست ڕۆژ لەبەر باران ماوەتەوە و دوواتر کەس نازانێت لافاو بۆ کوێی بردووە، پیاوە هیندیەکە سەری خستە ناو کۆشیەوەو گریانێک گریا هەر بەڕاستی من دەترسام دراوسێکانیان بێن و بەسەرمان وەربن. ئەو شەوە من ئاگام لێبوو پیاوە هیندیەکە تا بەیانی نەخەوت. بۆ بەیانیەکەی به جێبەکەی خۆی لە گەڵمان هات بۆ ناو کەلکەتاو ئەو دەمەش خواحافیزیمان لێکرد چاوەکانی وەک دوو چاوی کوندەپەپوویەک کرابوونەوە و پڕ بوون لە ئاو و ئیتر ئێمە جێمان هێشت و جارێکی تر نەمانبینیەوە.

*** *** ***

من وەک میلیاسم نەکرد درێژە بە خوێندن بدەم و بچم لە زانکۆیەک بخوێنم. هەر بە گەیشتنم بە تەمەنی شانزەساڵی قوتابخانەم جێهێشت و دەستمکرد بەکارکردن لەگەڵ باوکم. دەبێت ئەوەش بڵێم ئەوەی وای لە من کردبوو ڕقی دنیام لە قوتابخانە بێت و بە تاسەوە چاوەڕوانی تەمەنی شانزەساڵی بکەم بۆ ئەوەی وازی لێبهێنم ئەو هەموو هەراسانکاریە بوو کە لە لایەن منداڵانی لە خۆم گەورەترەوە ڕووبەڕووم دەبۆوە. من بەوپەڕی دڵگەرمیەوە یارمەتی باوکمم دەدا و ئێستاشی لەگەڵدابێت بۆ ساتێکیش چیە پەشیمان نەبوومەوە لەوەی وازم لە خوێندن هێنا. ڕاستە بە درێژایی کارکردنم لەگەڵ بابم من هیچ تەڕدەستی و لێزانیەکم پیشاننەدا لەوەی بتوانم وەکو ئەو ڕووەک و گوڵ و گژوگیا بکەم بە هەتوان یان عەتر، بەڵام بەو بەردەستی و وردە کارانەی لە بابەت ئامادەکردنی کەلووپەلەکان و کوڵاندنی گوڵو گیاکانو پاڵاوتنیان و پاککردنەوەی دوکانەکە سەرئێشەیەکی زۆرم لەکۆڵ بابم کردبۆوە. جگە لەوەش بەزۆری من مادە خاوەکانم دەکڕی. هەنگوین, ئەو کەرەسەیەی بەبەردەوامی پێویستمان بوو, لە پیاوێکم دەکڕی خەڵکی نیپاڵ بو و هەموو جارێک کە تەنەکە هەنگوینەکەی دەدامێ دەیگووت دوێنێ کوڕەزاکەم لە نیپاڵەوە هێناویەتی، بەڵام کاتێک سەیری جووڵەی لێوی و ملچەملچی زمانیم دەکرد لەناو دەمە بێددانەکەیدا دەمزانی درۆ دەکات و لە

گوندەکانی دەوروبەری کاردیف کڕیویەتی. گەڵای مێوم لە بێوەژنێکی پاکستانی دەکڕی و سەرجەم گوڵە کێویەکانمان لە ئەبەردینەوە بۆ دەهات. ئەو گوڵە کێویانە ژن و مێردێکی خەڵکی گڵاسگۆ بە پیکابێکی شین بۆیان دەهێناین. ئەو ژن و مێردە هەموو ئەو جارانەی دەهاتن بە هەر بیانوویەکەوە بووایە دەیانویست ئەو باسە بکەنەوە ئەوەی ئەوان خۆیان بە بەریتانی نازانن و دەیانەوێت سکۆتلەندا سەربەخۆ بێت. بەهارات و ئالات و زەردەچەوەشمان لەو دوکانە هیندیانە دەکڕی کە لە شارەکەماندا بە بەردەوامی لە زۆربووندا بوون. زەیتوونیشم لە پیاوێکی عەرەب دەکڕی. ئەو زەیتوونانەی لێرە هەبوون یان لە تورکیاوە دەهاتن یان لە یۆنانەوە، ئەوەش بە ئاشکرا لە سەر ڕووی بەرمیلە بچووکەکان و ئەو توورەکانەی زەیتوونی تێدا بوو دەنووسرا, کەچی کابرای عەرەب سوێندی دەخوارد زەیتوونەکەی زەیتوونی فەلەستینیی ئەسڵە.

ئەگەر باوکم ویستبای ئەو دەرمانانەی بۆ یارمەتیدانی هێورکردنەوەی دەمارەکانی مێشک و ڕەواندنەوەی خەمۆکی بەکاردەهاتن دروست بکات ئەوا من لکە وردەکانی سنەوبەرو گەڵای مێو و هەنگوینم لە ئاوەنێکدا بۆ دەکوتا. ئەگەر ویستبای ئەو دەرمانانەی بۆ کەمکردنەوەی ژانی کاتی منداڵبوون ژنان بەکاریان دەهێنا دروست بکات, ئەوا من لاولاو و ڕێحانەو بیزاو چوکەرەی

ڕوەکێکی تر کە ناوی لیک بو و باوکم پێی دەگوت 'پەنجەشەیتان' و لە هەرێمی یۆرکەشایەرەوە بۆمان دەهات، تێکەڵم دەکردن. هەموویانم لەناو مەنجەڵێکی گەورەدا دەکوڵاندن. دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر لەناو مەنجەڵەکەدا لە سەر ئاگر دەمانەوە - بە شێوەیەک تێکدەئالاّن جیاکردنەوەیان مەحاڵ بو، لە سەر ئاگرەکە دامدەگرتن‌و دەمپالاّوتن.

لە دوکانەکەدا دوو ئامێری پالاّوتنمان هەبوو، یەکێکیان تۆڕێکی تەلی بازنەیی تەنک بوو بە کلکێکی درێژەوە و هەر لەو تۆڕانە دەچوو کە زاناکانی زیندەوەرناسی پەپولەیان پێ ڕاودەکرد. بەلاّم پاڵوێنەکەی تر هیچ دەسکێکی نەبو و لە تەلێکی سپی شۆڕی تایبەت بوو. ئەو پاڵوێنەیان لە ماددەیەکی نەرم دروستکرابو و ئەو کاتەی ڕووەکە کوڵاوەکانم بەسەردا دەکرد وەک چیکڵدانەی ئەو باڵندە زلانەی قەراخ ئاوەکانی لێدەهات کە بەهۆی ماسی خواردنی زۆرەوە دادەچۆڕێت. دوای پالاّوتنەکە دەمخستنە ناو سەتڵێکی گەورەی پڕ لە لیمۆی گوشراو و ماستەوە. ئیتر لەوە بە دواوە من کارم پێیان نەدەماو باوکم پێیان ڕادەگەیشت و سەرپەرشتی قۆناغەکانی تری دروستکردنی عەتر و دەرمانەکانی دەکرد. بە درێژایی ئەو دوو ساڵەی لە گەڵ بابمدا کارم کرد زۆربەی کاتەکان بەیەکەوە بووین، جگە لەو کاتانەی میلیاس بە سەردان دەگەڕایەوە یاخود ئەو کاتانەی

من سەردانی ئەوم دەکرد و یەکدوو شەو لە لای دەمامەوە. بەڵام ئەو ئێوارەیەی دوو سەرخۆشە پەتیارەکە دوای ئەوەی لە قومار هەرچی پارەو پوولێک هەیانبووە دۆڕاندبویان و ویسکی و شەراب‌و ڤۆدگایەکی زۆریان خواردبۆوە، بەدمەستانە خۆیان بە دوکانەکەی باوکمدا کردبوو، من هەمووی نیوسەعات بوو گەڕابومەوە ماڵەوە بۆ ئەوەی ئەو کاتەیَ دایکم سەرقاڵی خواردن ئامادەکردن دەبێت من جلە هەڵخراوەکانی سەر تەنافی ناو باخچەکەمان کۆبکەمەوە نەبا باران تەڕیان بکات.

*** *** ***

دوای مەرگی بابم پیاوە هیندیەکە زۆر هانی ئەوەی دام لەسەر هەمان کار بەردەوام بم، بەڵام من توانای قسەکردنم لە دەست دابوو، ئەو توانایەش بۆ ڕاییکردنی ئیش‌وکارەکان پێویست بوو، جگە لەوەش من نەمدەتوانی وەک باوکم کارامە بم لە دروستکردنی عەتر و دەرمان. لە سەروی هەمو ئەمانەشەوە من چاوم بەرایی نەدەهات سەر بەو دوکانەدا بکەمەوە کە هێشتا بۆنی خوێنی باوکم تیایدا پەنگی خواردبۆوە، بۆیە ئەو ئیشەم لە خەیاڵی خۆم دەرکرد. ئەوەبوو دایکم دوکانەکەی فرۆشت بە کابرایەکی چینی و کابرای

چینیش سەرلەبەری دوکانەکەی تێکداو لە جێگاکەیدا دوکانێکی تری دروستکرد. ئەو دوکانەی ئەو پیاوە دروستی کرد بەشێکی زۆری دیوارەکانی لە شوشە بو و ڕۆبیان و پراون و قرژاڵی تێدا دەفرۆشت.

*** *** ***

بە پارەی دوکانەکەمان دایکم دوکانێکی تری کڕی و ئەو گوڵە سێبەریانەمان تیایدا دەفرۆشت کە بۆ ڕازاندنەوەی ناوماڵ بە کار دەهاتن. دایکم کارە سەرەکیەکانی دەکرد و منیش هاوکاریم دەکرد. ئەو کاتانەی لەناو دوکان ئیشمان نەدەبو یان مشتەری نەبوایە ئەوا من زیاتر خۆم سەرقاڵی خوێندنەوەی چیرۆک و ڕۆمان و ئۆتۆبایۆگرافیای نوسەرانی دنیا دەکرد. "ساڵەکانی سەگ" ی کۆنتەر گراس و "منداڵانی نیوەشەو" ی سەلمان ڕوشدی و " ناوی گوڵ" ی ئیمبەرتۆ ئیگۆم بەسەر یەکەوە و لە ماوەی مانگێکدا خوێندنەوە و ئیتر دنیایەکی فراوانی خەیاڵ و فەنتازیام بەسەردا کرایەوە.

جاروبار خانی یان پوورە ڕێبیکا سەردانی دوکانەکەیان دەکرد. لە یەکێک لەو ڕۆژانەدا بوو پیاوە هیندیەکە هات بۆ دوکانەکەمان بۆ

ئەوەی پێمان بڵێت بەتەمایە بۆ یەکجاری بگەڕێتەوە هیندستان. بە ئەسپایی پێی نایە ناودوکانەکە و سڵاوی کرد. بە منی گوت " چۆنی گۆشتخۆر؟"، من باوەشم پێداکرد و ئەو وەک عادەتی خۆی سەرمی ماچکرد. ئەو گوتی مانگی داهاتوو دەگەڕێتەوە بۆ هیندستان. من حەپەسام و پێم گوت " ئەی پێش ئەوەی بڕۆیت میلیاس نابینیت؟"

"هەڵبەتە سەردانی دەکەم و هەر ئێستاش وا لە نووسینگەی بلیتفرۆشی دەگەڕێمەوە. بلیتی سەعات ١١ ی سەر لەبەیانی دووشەممەی داهاتووم بڕیوە بۆ بێلفاست و شەوێک لای ئەو گۆشتخۆرە دەبم" پیاوە هیندیەکە بە سیمایەکی کراوەوە ئەوەی گوت.

ئەو ڕۆژەی پیاوە هیندیەکە گەڕایەوە هیندستان من و دایکم و پوورە ڕێبیکام و خانی تا فڕۆکەخانە بەڕێمانکرد. هەرچەندە کەسمان باسمان نەکرد بەڵام هەمووومان دەمانزانی لە دەستچوونی بابم کە برادەرێکی دێرینی خۆی بو و ئەو برادەرایەتیە دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی هەرزەکاری ئەوان، هۆیەکی گرنگ بوو بۆ ئەوەی پیاوە هیندیەکە ئێرە جێبهێڵێت.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

# سوهاترا

یەکەم جار بابم پیاوە هیندیەکە لە قوتابخانەکەیان دەبینێت. ئەو کاتە باوکم هەرزەکارێک دەبێت لەو هەرزەکارانەی لە ناو پاس و پارک و شوێنە گشتیەکاندا گاڵتە بە ژنان و پیاوانی پیر دەکەن. کاتێک باوکم و هاوەڵەکانی بۆ یەکەمجار چاویان بە کوڕێکی گەنجی هیندی دەکەوێت جلێکی هیندی سپی شۆڕی لەبەردایە و مێزەریکی گەورەی پرتەقاڵی لەسەرە پێکەنینیان پێیدێت و دەیانەوێت گاڵتەی پێبکەن، پێیدەڵێن لە فلیمی هیندیدا تۆمان بینیوە. گەنجە هیندیەکە بە شەرم و حەیاو ویقارێکی بەگزادانەوە پێیاندەڵێت" گەلۆ، چما گاڵتەم پێدەکەن؟"، دەستیان بۆ درێژ دەکات تۆقەیان لە گەڵدا بکات و دەڵێت " ئەز ناوم سوهاترایە، خەڵکی کەلکەتام و دوو مانگ دەبێت ماڵمان هاتوە بۆ ئێرە، دەکرێت ببینە برادەر؟" بەڵام ئەوان تۆقەی لەگەڵ ناکەن و دوو هاوەڵەکەی بابم لە باتی تۆقە کردن دەست بۆ ناوگەڵی خۆیان دەبەن و پێیدەڵێن "گاپەرست". بابیشم بە پێکەنینێکی هەرزەکارانەی ناقۆڵاوە ویستبووی تیروتانەی لێبدات و پێی گوتبوو "ئەو مێزەرە بە کەڵکی چیدێت مستەر سوهاترا؟". سوهاترا ڕوو دەکاتە بابم و پێیدەڵێت "ئەو مێزەرە بە کەڵکی شتێک هەر دێت" و

ئیتر جێیاندەهێڵێت. دوو هەفتە دوای ئەو دیدارە لە سەر ڕێگای گەڕانەوە لە قوتابخانەوە بەرەو ماڵ، بابم لەگەڵ هاوەڵەکانی خۆی لەسەر بابەتێک کە ڕوون نیە چی بووە دەبێتە شەڕیان و لەو شەڕەدا بابم وەک هەمیشە لێدانێکی باش دەخوات. دوای ئەوەی هاوەڵەکانی باوکم ڕادەکەن و باوکم بە نیمچەبوراوەیی بە جێدەهێڵن، کوڕە هیندیەکە ڕادەکات لە یەکێک لە بەلووعەکانی ئاوی قوتابخانەکە مێزەرەکەی تەڕ دەکات و دەگەڕێتەوە ناوچاوانی بابمی پێ فێنک دەکاتەوە ئەو کاتەی بە زمانی شکاوەوە لە ناو خۆڵی قەراخ شۆستەکە کەوتووە. کاتێک بابم کەمێک دێتەوە سەر خۆی دەبینێت کوڕە هیندیەکە ئەو مێزەرە تەڕە بە ناوچاوانیدا دەهێنێت، هەمان ئەو مێزەرەی ئەو دووهەفتە پێشتر پێی وابوو بە کەڵکی هیچ نایات. ئەو ڕۆژە دەبێتە سەرەتای هاوڕێیەتیەکی دوورودرێژ لە نێوان بابم و پیاوە هیندیەکە، ئەو هاوڕێیەتیە گەیشتە ئاستێک جگە لە مەرگ هیچ شتێکی تر نەیتوانی کۆتایی پێبهێنێت. ئێستا من لێرە ئەم دێڕانە دەنووسم، دەبێت بە ئەمەکناسیەوە دان بە ڕاستیەکدا بنێم، ئەو ڕاستیەش ئەوەیە: باوکم تا مرد بە وەفاداری بۆ دایکم و دڵسۆزی بۆ من مایەوە، باوکم لە هاوەڵە خراپەکانی دوورکەوتەوەو ژیانی بە تەواوەتی ئاراستەیەکی تری وەرگرت، باوکم وازی لە خواردنی گۆشت هێنا و هەموو ژیانی تەرخان کرد بۆ ئەوەی لە گوڵی کێوی

و گژوگیا عەترو داوودەرمان دروست بکات، هەموو ئەوانە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکی ئەو لەو پیاوە هیندیە.

دوواتر باوکم دەچێتە زانکۆ بۆ خوێندن لە بەشی دەرمانسازی. پیاوە هیندیەکەش خۆی نقومی خوێندن و توێژینەوە دەکات لە تێکستە ئاینیە کۆنەکانی هینددا. دووای ئەوەی خوێندن تەواو دەکەن بە یەکەوە سەفەرێکی هیندستان دەکەن و بۆ ماوەی سێ مانگ لە گوندێک دەمێننەوە. باوکم لەو گوندە پیاوێک دەناسێت ناوی " شالمار گودوارا" دەبێت. ئەو کات شالمار پیاوێکی پیری تەمەن هەشتا ساڵ بووە و سەرقاڵی دروستکردنی هەتوان بووە لە گژوگیای کێوی بۆ چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشیانەی لە گوندەکانی ئەو دەوروبەوەدا توشی ئاژەڵەکان بووە. بابم بە چاوی خۆی دەیبینێت شالمار بەو دەرمانانەی کە خۆی دروستی کردووە لە ماوەیەکی کەمی دوو مانگیدا زامەکانی مانگایەک سارێژ دەکات دووای ئەوەی گورگێک بە سەختی ژێر سکی و گووانەکانی هەڵدڕیبوو. پێشتر کەسانی جیاواز هاتبوون بۆ لای شالمارو لێی پاڕابوونەوە نهێنی دروستکردنی ئەو دەرمانانەیان بۆ ئاشکرا بکات، بەڵام ئەو بڕیاری دابوو تەنیا ئەو نهێنیە بۆ کەسێک ئاشکرا بکات تاکە مەبەستی دروستکردنی دەرمان بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکان بێت نەک بیکات بە پیشەیەک بۆ ژیان و پارە

پەیداکردن. دووای ئەو سەفەرە باوکم خولیای دروستکردنی عەترو داوودەرمانی دەکەوێتە سەر و ئیتر چەند جارێکی تر سەردانی شالمار دەکات. شالمار کاتێک ئەو خوێنگەرمیەی باوکم دەبینێت، بڕیار دەدات نهێنی چۆنیەتی دروستکردنی ئەو دەرمانانەی پێبڵێت. هەر هەمان ئێوارە شالمار بە دورودرێژی وردەکاریەکانی هونەرەکەی بۆ باوکم باسدەکات، ئینجا بە باوکم دەڵێت " بەڵام هیربەرت بیرت نەچێت تەنیا زانینی ئەو شتانە بەس نین بۆ ئەوەی بتوانیت هەتووان دروست بکەیت، بەڵکو لەو کارەدا دڵگەرمیەک و عەشقێک وەک ئەو عەشق و دڵگەرمیەی ئێستا من لە تۆدا هەستی پێدەکەم هەمیشە پێویستە. ئەگەر وانەکەیت، ئەوا لە جیاتی سارێژکردنەوە، دەردی دەردەدارو زامدارەکان گرانتر دەکەیت". بابم سوێندی بۆ دەخوات هەرکاتێک عەشقی بۆ کارەکە نەما وازی لێبهێنێت. هەر ئەو ئێوارەیەش دەبێت باوکم و شالمار تاوتوێی ئەوە دەکەن کە چۆن دەکرێت ئەو دەرمانانە و چۆنیەتی دروستکردنەکەیان گۆڕانی بە سەردا بهێنرێت، بە شێوەیەک بکرێت زام و دەردەکانی مرۆڤیشی پێ چارەسەر بکرێت. ساڵانێکی زۆر دوای ئەو ئێوارەیە من و میلیاس سەردانی پیاوە هیندیەکەمان کردو هەواڵی "شالمار گودوارا"مان پرسی، بەڵام ئەو چەند ساڵێک بوو مردبوو.

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

میلیاس خوێندنی تەواوکرد و گەڕایەوە شارەکەی خۆمان ئینجا دەستی کرد بە کارکردن لە سەنتەری شوێنەوارناسی ناوچەکەمان. ڕاستە ئێمە دراوسێ بووین، بەڵام من بە بەردەوامی لە دوکانەکە لەگەڵ دایکم بوم ومیلیاسیش هەفتەی پێنج ڕۆژ ئیشی دەکرد، بۆیە ئێمە تەنیا شەممە و یەکشەممانمان بەدەستەوە بوو بەیەکەوە بەسەرببەرین.

دوو ساڵێک دوای مەرگی بابم هیچ شتێکی زۆر گرنگ لە ژیانی ئێمەدا ڕوویندا. من لەگەڵ دایکم لە دوکانەکەدا کارم دەکرد و دەمخوێندەوە. میلیاسیش بە هەمان شێوە کاری دەکرد و سەرگەرمی شارەزابوون و توێژینەوە بوو لە کاری شوێنەوارناسیدا. ئەو دەمانەش یەکترمان دەبینی من نەمدەتوانی قسە بکەم، نەمدەتوانی باسی ئەو کتێبانە بکەم کە دەمخوێندنەوە، یان ئەو خەونانەی شەوانە دەمبینین. زۆرم حەز دەکرد ئەگەر تەنیا بۆ یەک جاری تریش بووایە بە زمانی خۆم بە میلیاس بڵێم زۆرم خۆشدەوێت. بەڵام میلیاس دەیزانی چەندم خۆشدەوێت. کاتێک دەستم بە قژە برۆنزیەکەیدا دەهێنا، پەنجەکانم دەخستنە سەر

ڕوومەتی، بە گەرمی و سۆزێکی زۆرەوە باوەشم پێدادەکرد و بە تاسەوە ماچم دەکرد، ئەو دەیزانی بۆی مردووم، ئەو دەیزانی من هەلاهەلا بووم بۆی. تەنیا ئەو قسەی دەکردو منیش گوێم دەگرت. باسی گۆزەیەکی دەکرد کە لە" ئامەد" دۆزراوەتەوە و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی جەنگیز خان، باسی باوکی خۆی دەکرد کە چۆن بە گەنجی لە دەست جەنگ و ستەمکاری هەڵاتووە. باسی ئەو نامیلکە بچووکەی دەکرد، نامیلکەیەک باوکی دوای خۆی بۆ ئەوی بە جێهێشتبوو. باسی یادگاریەکانی خۆی لەگەڵ بابم دەکرد. باسی نیگەرانی خۆی دەکرد سەبارەت بە نەبوونی هیچ هەواڵێک لە لاسەوە. باسی قەشە لاوەکەی دەکرد. باسی پیاوە هیندیەکەی دەکرد و دەیگوت "ئۆفیلیا من زۆر بیری پیاوە هیندیەکە دەکەم، زۆر". ئینجا سەیری منی دەکرد و دەیگوت "ئەی تۆ؟". ئەو دەمانەی ئەو پرسیارەی لێدەکردم، من بەدەم زەردەخەنەیەکەوە دەموچاوم وەک دەموچاوی منداڵێکی لێدەهات کە بیەوێت بگری. بە نیشانەی ئەرێ سەرم ڕادەوەشاند. لەو کاتانەدا جارجاریش نوکتەی لە سەر پیرێژنە دڵتەڕەکەی خاوەن ئاپارتمانەکەی بێلفاست دەکرد. باسی ئەو ڕۆژەشی دەکرد ئەو دەمەی پیرێژن سەیری خوار ناوکی میلیاسی کردبوو. من پێدەکەنیم و بە دەست خۆم نەبوو لە قوڵایی دڵمەوە

ڕقم لەو پیرێژنە هەڵدەستا کە بە چاوی ئالۆشاویەوە سەیری میلیاسەکەی منی کردبوو.

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

ئێمە جاروبار سەردانی ئیلیامان دەکرد. ئەو گۆشەگیرانە دەژیا بەڵام دوو ساڵ زیاتر بوو هیچ هەواڵێکمان لە لاسەوە نەدەزانی. لاس و ئیلیا هەر یەکەیان لە وڵاتێکی جیاوازەوە هاتبوون و لە ماڵی خانی نیشتەجێ ببوون. بۆ من سەیر بوو لە پڕ دوو پیاوی نەناس هاتن و هەر زۆر زوو وەک دوو ئەندامی ناو خێزانی میلیاسیان لێهات. ئەو ڕۆژەی ئەوان هاتن من و میلیاس لەگەڵ قوتابیانی قوتابخانەکەمان چووبووین سەیری پیشانگایەکی گەورە بکەین. ئەو پیشانگایە تایبەت بوو بە ئیشی دەست و سیرامیکی بەرهەمی ڕەنجی قوتابیە بەهرەمەندەکانی قوتابخانەکەی ئێمە. ئێوارەکەی کاتێک گەڕاینەوە ماڵی میلیاس دوو کوڕی گەنجمان بینی لە حەوشەکەدا لەگەڵ خانی دانیشتبوون. ئێمە بەخێرهاتنی ئەوانمان کرد و ئەوانیش بە شەرمەوە لە بەرمان هەستان. خانی بە ئێمەی گوت "ئەوە لاسە، دیارە پێشتر بۆم باسکردوون. ئەوەش هاوڕێکەیەتی و ناوی ئیلیایە ". ئینجا خانی ڕووی کردە میوانەکان و گوتی "ئەوەش میلیاسی کوڕم و ئۆفیلیای

کچی خاڵیەتی ". دوو کوڕە گەنجەکە بە چەند ووشەیەکی کەمی ئینگلیزی کە بە خراپی گۆیان دەکردن و بە سیما و جووڵەی دەستەکانیان تێیان گەیاندین فرە خۆشحاڵن بە بینین و ناسینمان.

بە درێژایی ئەو ماوەیەی ئەو دوو کوڕە لە ژوورێکی ناو باخچەکەی پشتەوەی ماڵی میلیاس بوون من نەمتوانی ببمە هاوڕێیان، بەڵام میلیاس زۆر هۆگریان ببوو، بە تایبەت هۆگری لاس، چونکە دەیانتوانی بە کوردی قسە بکەن. میلیاس بە هۆی باوکیەوە کوردیەکی باشی دەزانی، بەڵام من پێش ئەوەیش لاڵ بم لە سێ چوار ووشە بترازێت کە بە تێکشکاوی دەمگوتن شتێکی ترم نەدەزانی. ئەوەش زۆر جار وای لە میلیاس دەکرد بە سوعبەتێکی تێکەڵ بە ڕاستی نیگەرانی خۆی دەربڕێت.

پێش ئەوەی ئەو کوڕانە بێن بۆ ماڵی میلیاس، باوکی میلیاس بۆی باسکردبووین کوڕێکی کوردی خزمیان بە ڕێگاوەیە و دێت بۆ ئێرە. خانی هەنگاو بە هەنگاو ئاگای لە لاس بوو، دوای ئەوەی هاتن و لە ماڵی میلیاسیش نیشتەجێ بوون، باوکی میلیاس بە ڕادەیەک بایەخی بەو کوڕە دەدا کە نەک هەر سەرنجی من و میلیاسی ڕاکێشا، بگرە دەتوانم بڵێم بەلای خودی لاسیشەوە چاوەڕوان نەکراو بوو.

ئەو ساڵانەی ئەو دوو کوڕە گەنجە لەماڵی میلیاس ژیان هیچ شتێکی گرنگ لە ژیانی ئێمەدا ڕووی نەدا. من و میلیاس سەرگەرمی خوێندن بووین. خانیش هەفتەی دوو ڕۆژ لەگەڵ پیاوێکدا خەریکی کاری دارتاشی بوو. ڕۆژەکانی تریش لە ماڵەوە خۆی سەرقاڵی کاری باخچە و ناوماڵ دەکرد. لاس و ئیلیاش هەم کاریان دەکرد هەم خەریکی فێربوونی زمانی ئینگلیزیش بوون.

*** *** ***

چەند مانگێک پێش ئەوەی لاس بۆ یەکجاری بگەڕێتەوە وڵاتەکەی خۆی، هەستکردن بە گوناه سەبارەت بە بەجێهێشتنی دایکە بێوەژنەکەی کە بە هەتیوی ئەوی بەخێو کردووە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر ڕۆحی دەئاوساند. ئەو بە میلیاسی گوتبوو شەوانە تارمایی ئەو ژنە ناهێڵێت بخەوێت. ئیلیاش بە هۆی ئەو قورساییەی یادەوەری ئیشماعیلۆڤ و منداڵانی شامالا بە سەریەوە هەیبوو ڕۆژ بە ڕۆژ بێدەنگتر و غەمناکتر دەبوو. شەوێکیان تەنیا لاس و ئیلیا و میلیاس لە ماڵەوە دەبن، دوای ئەوەی دەربارەی چەندان بابەت قسە دەکەن، لاس و ئیلیا سەرجەم لاپەڕەکانی ژیانی خۆیان بۆ میلیاس هەڵدەدەنەوە.

# لاس چیرۆکی خۆی دەگێڕێتەوە

"من ڕۆژانی مندالّی خۆم بە بیر نایات، بەلاّم دەزانم مندالّێکی بەختەوەر نەبووم. بە هۆی سالّە قورس و ناکامەکانی هەرزەکاری و ڕۆژە تاریکەکانی گەنجیم هێندەی دیکەش ئەو وێنە تەلّخانەی مندالّیم کە لە یادەوەریمدا مابوون سڕرانەوە. من لە چووار مانگیمەوە تا تەمەنی هەشت سالّیم لە گەلّ دایکە بێوەژنەکەم هەر دەمەی لە کوچەی شارێک و گوندێک دەژیاین. ئەو کاتەی بوومە هەشت سالانیش من و ئەو هاتینە ناو قەلاّیەکی کۆنەوە و لە ناو مالّێکی نیمچە کەلاوە و وێراندا نیشتەجێ بووین. دایکم دەیگوت ئەوە مالّە کۆنەکەی خۆمانە. ئەو قەلاّیە ڕێک کەوتبۆ چەقی شارەکەمانەوە – لە سەر بەرزاییەک. زۆر جار گوێم لێببوو گوایە ئەم شارە کۆنترین شاری دنیایە. هەر لە مندالّیەوە گوێم لێبووە گوتویانە هۆلاکۆ دوای ئەوەی سەدان گوند و شاری بە هێز و دەیان قەلاّی پۆلایین دەخاتە ژێر سمی ئەسپی جەنگاوەرەکانیەوە، لە بەردەم دانیشتووانی ئەو قەلاّیەدا بە چۆکدا دێت. خەلّکێکی بێشومار شانازیان بەو چیرۆکانەوە دەکرد، خەلّکێکی زۆر لە دۆخێکی دژوار و مەرگباردا دەژیان و دلّی خۆیان بەو چیرۆکانە خۆشدەکرد. بەلاّم من ڕۆژ بە

ڕۆژ زیاتر هەستم بەوە دەکرد من شتێکم نیە شانازی پێوە بکەم. من نەمدەتوانی شانازی بە وڵاتێکەوە بکەم کە لە پێناویدا هێشتا چوار مانگان بووم باوکمم ونکرد. وڵاتێک دوای ئەوەی لە هەموو شتێک مەحروومی کردم، وەک هەتیوێک فڕێیدامە سەر جادە خۆڵاوی و نەفرەتاویەکانی خۆی. شانازی چیم بە قەڵایەکەوە کردبا کە هەر بەڕاستی وەک جەهەننەمێکی بچکۆلە بوو بۆ من. من چیرۆکی خۆم بەتەواوی نازانم، تەنیا ئەوە نەبێت دایکم بۆی باسکردم گوایە باوکم ئەو کاتەی لە ناو جەنگاوەرەکانی دژ بە حکومەت جەنگاوە وون بووەو ئەوان هیچ دەربارەی نازانن، بەڵام زۆر جار دەیگوت پیاوێک لە دەرەوەی وڵاتەو ئەو زۆر شت دەربارەی باوکت دەزانێت.

بەپێی قسەکانی دایکم بێت ئەو کاتەی من چوار مانگان بووم، ئێوارەیەک کۆمەڵێک چەکدار خۆیان دەکەن بەماڵی ئێمەدا و دەیانەوێت باوکم و سێ پیاوی ئێرانی میوانمان دەستگیر بکەن و بیانبەن لە گەڵ خۆیاندا. ئەو چەکدارانە پێش ئەوەی بێن بۆ ماڵی ئێمە هەوڵدەدەن لە بەر دەرگای مزگەوتەکەی نزیک ماڵی خۆمان باوکم و ئەو سێ پیاوە ئێرانیە دەستگیر بکەن. لەکاتێکدا پیاوە ئێرانیەکان و باوکم لە حەوشەی مزگەوتەکە دێنە دەرەوە، باوکم لە دوورەوە چەکدارەکان دەبینێت و هەست دەکات دەیانەوێت لێیان

نزیک ببنەوە. باوکم بە هۆی ئەو ئەزموونە تاڵانەی لە گەڵ حکومەت هەیبووە تێدەگات ئەو چەکدارانە نیازیان باش نیە، ئەوە جگە لەوەی سێ پیاوی ئێرانیشی لە گەڵدایە، لە کاتێکدا عێراق و ئێران تازە کەوتبوونە ناو شەڕێکی بێئامانەوە دژی یەکتر و وەک دوو تیمساح یەکتریان هەڵدەدڕی. باوکم بە شپرزەیی هەڵدێت و بە پیاوە ئێرانیەکان دەڵێت ڕاکەن بە دووای مندا. بەڵام سێ پیاوە ئێرانیەکە هیچ حاڵی نابن و لە شوێنی خۆیان دەچەقن. ئەو کاتەی باوکم بە ڕاکردن خۆی دەکات بە یەکێک لەو کۆڵانە تەسک و تاریک و کۆنانەی ناو قەڵاکە کە سەدان ساڵە نەگۆڕاون، پیاوە ئێرانیەکان دەحەپەسێن. چەکدارەکان دەگەنە سەریان و چوار دەوری پیاوەکان دەگرن، پیاوەکانیش وەک سێ کەروێشکی تۆقیو لە بەردەمیان گرمۆڵە دەبن. چەکدارەکان دەستی پیاوە ئێرانیەکان لە دوواوە شەتەک دەدەن و چاویان دەبەستن و فڕێیان دەدەنە ناو زیلێکی کۆنەوە.

دووای ئەوەی باوکم لە بەر چەکدارەکان هەڵدێت و بۆیان دەستگیر ناکرێت، چەکدارەکان خۆیان دەکەن بە ماڵی ئێمەدا، بەڵام کەسی لێنابێت تا دەستگیری بکەن. دایکم دەیگوت لەو کاتەدا چەکدارەکان هاتن بۆ ماڵی ئێمە هەر تەنیا من و دایکم و بێوەژنێکی دراوسێمان لەوێ دەبین، بۆیە چەکدارەکان دوای پشکنینی ماڵەکە دەڕۆن.

ئەو ئێوارەیە باوکم ڕادەکات، دەچێت بۆ ماڵی ناسیاوێکی خۆی و لەوێ دەمێنێتەوە و دووای دوو ڕۆژ نە هیچ هەواڵێک لە دایکمەوە دەبێت نە ئەویش دەتوانێت پەیوەندیمان پێوە بکات. بۆیە ئەو واتێدەگات چەکدارەکان دایکم و پیاوە ئێرانیەکانیان بردووە و لە ڕێگەی ژنی ئەو ماڵەی باوکم خۆی تێدا حەشارداوە بۆی دەردەکەوێت کە ماڵی ئێمە لە ژێر چاودێری پیاوانی حکومەتدایە، بۆیە هیچ ڕێگایەکی بۆ نامێنێتەوە جگە لەوەی شار جێبهێڵێت و ڕووبکاتە شاخ بۆ ناو ئەو چەکدارانەی ئەو کات دژی حکومەت لە جەنگدابوون. باوکم پێش ئەوەی شار جێبهێڵێت تەنانەت دەرفەتی ئەوەی نابێت منیش ببینێتەوە. دایکیشم دووای ئەوەی قەلاکە بە جێدەهێڵێت دووای هەواڵپرسیەکی زۆر بۆی دەردەکەوێت باوکم ڕایکردووە بۆ شاخ. ماوەیەک دەنگوباسی یەکتر دەزانن بەلام ئیتر باوکم بۆ هەتا هەتایە وون دەبێت.

دایکم زۆر جار باسی ئەو ڕووداوانەی کردووە بەلام نەک هەر من بەتەواوی تێنەگەیشتووم، بەڵکو هەر جارێک ئەو چیرۆکانەی گێڕاوەتەوە من نیگەرانتر و دوودڵتر بووم. ئەو زۆر جار باسی ڕاکردنی باوکم بۆ ناو چەکدارەکانی دژی حکومەتی کردووە و سوێندی خواردووە هیچی تر لە سەر باوکم نازانێت. دایکم هەمیشە پێی گوتووم پێویستە من خانی ببینم. دایکم پێی گوتم خانی هەموو

شتێک لە سەر باوکم دەزانێت، بۆیە ئێوە با بزانن هاتنی من هیچ پەیوەندی نییە بە هاتنی ئەو هەزاران کوردەوە کە وەک لافاو ڕوو دەکەنە ئێرە. من بۆ ئەوە هاتووم قسە لە گەڵ خانی بکەم. بۆ ئەوە هاتووم خانی باسی باوکم بکات، پێم بڵێ باوکی من چی بەسەرهات و بۆ وون بوو؟ چی لێهات و لە کوێیە؟. من ئەو دەمەی لە وڵات بووم خانی زۆر جار بە تەلەفون قسەی لە گەڵدا کردووم و زۆریش یارمەتی منی داوە، بەڵام هەر کاتێک پرسیارم دەربارەی باوکم لێکردووە ئەو هەمیشە یان خۆی دزیوەتەوە یان پێی گوتوم ' لاس پەلە مەکە، وەرە بۆ ئێرە هەموو شتێکت بۆ باسدەکەم، هەموو شتێک'. ئازیزانم ئیلیا و میلیاس، من ئێستا لێرەم بۆ ئەوەی خانی هەموو شتێکم بۆ باس بکات لە سەر باوکم، هەموو شتێک".

ئەو کاتەی لاس ئەو قسانەی بۆ میلیاس و ئیلیا کردبوو، قەت ئەوەی بە خەیاڵدا نەهاتبوو خانی باوکیەتی و ئەو ژنەش کە بە خێوی کردوە و لاس وادەزانێت دایکیەتی، دایکی نیە بەڵکو بێوەژنێکی دراوسێی خۆیانە و دوای گیرانی دایکی و ڕاکردنی باوکی بڕیار دەدات بە خێوی بکات. بەڵام لاس لە بەر چەند هۆیەک کە نە من و نە میلیاس نایزانین باسی دەنکەهەناری نەکردبوو، هەروەها باسی شاعیربوونی خۆیشی نەکردبوو.

# تفەنگە ڕەشەکان

## ئیلیا چیرۆکی خۆی دەگێڕێتەوە

من هەرگیز نەمزانی کوڕی کێم. شەوێکی درەنگ، پیاوێک بە شپرزەیی سەیارەیەکی کۆنی ڕۆمانی لێدەخوڕێت. دوواتر ئەو پیاوە لەبەردەم کەنیسەی جۆزیفی پیرۆز کە دەکەوێتە لای باکووری شاری سەرایڤۆ، سەیارەکەی ڕادەگرێت و منداڵێکی قوماتەکراو کە لە ناو زەمیلەیەک لەو زەمیلانەی پیرێژنە گوندیەکان هێلکەی مراوی تێدەکەن دانراوە دادەگرێت. ئینجا سەیارەکە بە خێرایی لەو ناوە دوور دەکەوێتەوە. بۆ بەیانی زووی ڕۆژی دوواتر یەکێک لە ژنە ڕاهیبەکان، لەو ڕاهیبانەی لە دێرێکی تەنیشت کەنیسەکە لەگەڵ کۆمەڵێک ڕاهیبەی تردا دەژین یەکەم کەس دەبێت منداڵە قوماتەکراوەکە دەبینێت. منداڵە قوماتەکراوەکە من دەبم، ئەو کاتەی تەمەنم تەنیا یەک شەو دەبێت و دوای ئەوەی گەورەش بووم زۆر

جار ئەوەم بیستووە گوایە دووای ئەو شەوە دەنگۆی ئەوەش بڵاو دەبێتەوە کە ڕەنگە من منداڵی یەکێک لە ژنە ڕاهیبەکان بووبم بەڵام بۆ ئەوەی کەنیسە نەکەوێتە بەردەم ئابڕووچوونێکی لەو بابەتە، مەسەلەکە پەردەپۆش دەکەن. دوای ئەوەی من دەبەنە ژورەکەی خۆیان تا بەتەواوی ڕۆژ دەبێتەوە و ئینجا ئەو ژنە ڕاهیبەیەی منی دۆزیبۆوە دەچێت بۆ لای گەورە قەشەی کڵیساکە و باسی منی بۆ دەکات. ئیتر بڕیار دەدەن من ببەن بۆ خانەیەکی هەتیوانی سەر بە هەمان کڵێسا. من تەنیا پێنج مانگ لەو خانەیە دەبم و لەپڕ خانەکە بە هۆی چەند کێشەیەکی ئیداری و ماددیەوە دادەخرێت. هۆیە بنەڕەتیەکەش ئەوەدەبێت حکومەت ڕازی نەببوو چیتر هاوکاری ئەو خانەیە بکات. بۆیە ئەو منداڵە بێ دایک و باوکانەی لە چەشنی من کە لە خانەکەدا بووبووین دابەشمان دەکەن بە سەر ئەو ژن و پیاوانەی بێمنداڵن و ئەوان ڕەزامەندی پێشاندەدەن بمانگرنە خۆیان. من بەر ژن و پیاوێکی لاو دەکەوم. ئەوان موسوڵمانی ئەلبانی بوون و ژنەکە بە هۆی هاتنی کووانێک لە ناو منداڵدانیدا دکتۆرەکان بۆ یەکجاری هیوابڕاویان کردبوو بەوەی قەت ناتوانێت منداڵی ببێت. من نازانم بۆچی ئەوان هەر لە منداڵیەوە پێیان گوتم کە من منداڵی ئەوان نیم، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا من بۆ یەک دەقەش چییە هەستم بە بێنازی نەکرد. نەک هەر ئەوە، بگرە هەموو ئەو شتانەیانەی دایک

و باوکێکی زۆر چاک بۆ منداڵەکانی خۆیانی دەکەن ئەوان بۆ منیان کرد. هەرچەندە ئەوان لەو ژن و پیاوانە بوون کە ژمارەیان لە دنیادا ڕۆژ بە ڕۆژ لە کەمبوونەوەدایە و هەرگیز بۆ ئەو هەموو میهرەبانیەی لە گەڵ مندا نواندبوویان چاوەڕێی هیچ پاداشتێک نەبوون، لەگەڵ ئەوەشدا من قەت داخم ناچێت هەرگیز نەمتوانی بچوکترین شت بۆ ئەوان بکەم. ئەو کاتەی قوتابی دواقۆناغ بووم لە خانەی پێگەیاندنی مامۆستایان لە بۆسنە، ڕۆژێک نێردراوێکی تایبەتی لە سەرایڤۆوە هاتبوو تا هەواڵی مردنی ئەوانم پێبڵێت. هەرچەندە لە ڕۆژنامە و ڕاگەیاندنی ڕەسمی حکومەتدا وا ڕاگەیەنرا گوایە ئەوان بەهۆی شۆرتی کارەباوە لە ماڵەکەی خۆیاندا سووتاون، بەڵام زۆربەی زۆری خەڵکی گەڕەکەکە دەیانزانی ئەوە درۆیە. ڕاستیەکەی ئەوەبوو شەوێکی درەنگ چەند گەنجێکی توندڕەوی سربی دەزانن ئەوان تاقە ماڵی موسوڵمان دەبن لەو گەڕەکەدا و لە کاتێکدا ئەوان خەوتوون، دەچن نەوتێکی زۆر بە حەوشە و بانی ماڵەکەیاندا دەکەن و ئاگریان تێبەردەدەن. ئەوەش ڕێک لەو ساڵەدا بوو کە وردە وردە نەتەوەپەرستە سربەکان ئاگری ڕق و فیتنەیان خۆشدەکرد. هەر ئەو ئاگرخۆشکردنەش بوو دواتر قەتڵ و عامی ئەلبانەکانی بەدوودا هات و گوللەبارانکردنی منداڵەکانی شامالا بەشێکی زۆر بچووک بوو لەو کۆمەڵکوژیە.

گوندی شامالا لە سەرایڤۆوە هەر بیست کیلۆمەترێک دوور دەبوو. بە تەنیشت ئەو گوندەوە گوندێکی تر هەبوو ناوی گیرڤۆ بوو. من دوای ئەوەی خوێندنم تەواو کرد، بووم بە مامۆستای سەرەتایی لە گوندی گیرڤۆ. ئەو قوتابخانەیەی من بووم بە مامۆستا تیایدا تەنیا سیانزە قوتابی هەبوو. چوار لەو قوتابیانە لە گوندی شامالاوە دەهاتن. نیوەڕۆیان هەر چووار قوتابییەکەی گوندی شامالا، کە کچێک و سێ کوڕ بوون، بە یەکەوە دەهاتن و ئێوارانیش بە یەکەوە دەگەڕانەوە گوندەکەی خۆیان. ئەو ساڵە ڕێک هەر ئەو ساڵە بوو بۆسنەوهەرسک یەکپارچە ببوو بە تارمایی ئەو پیاوە دەمامک بەسەرانەی کە ئێوارانی درەنگ یان شەوانە لە کۆلانە تەسکەکانی شارەکان و دەوروبەری ئاواییەکان دەردەکەوتن و بە شێوەیەکی خێراو بە توندوتیژیەکی ئەفسانەیی نێچیرەکانی خۆیان سەردەبڕی. ئەو نێچیرانەش هەمیشە ئەو موسوڵمانە هەژارو بێچەک و بەلەنگازانە بوون کە لە مزگەوت دەهاتنەوە یان لە کارکردن لە ناو کێڵگەکانیانەوە دەگەڕانەوە.

دانیشتووانی گوندی گیرڤۆ هەموویان موسوڵمان بوون. لە قوتابخانەی گوندەکەدا تەنیا من و مامۆستایەکی تر دەرسمان دەووتەوە کە ناوی ئیشماعیلۆڤ بوو. ئیشماعیلۆڤ گەنجێکی بۆسنەیی ڕەسەن بوو و کوڕی خانەدانێک بوو. ئەو سەر بەو

بنەماڵەیە بوون کە لەو گرانیەی جەنگی جیهانی دووەم بە دووای خۆیدا هێنابووی، بەو سەروەت و سامانەی هەیانبوو سەدان کەسیان لە برسێتی ڕزگارکردبوو.

نەک هەر من و ئیشماعیلۆڤ، بگرە هەموو دانیشتووانی ئەو ناوچەیە وردە وردە لە ئێواران بە دوواوە گوێمان لە دەنگی تەقەی ئەو تفەنگانە دەبوو کە لە گوند و دەشتایی و لێڕەوارەکانی ئەو دەوروبەرەوە دەهات. ئەمەش وایکردبوو ئەو چووار قوتابیەی لە گوندی شامالاوە دەهاتن هەست بە نیگەرانی و دڵەڕاوکێیەکی زۆرتر بکەن، بە تایبەت ئەوان ناچار بوون ئێواران درەنگ بگەڕێنەوە. ڕۆژێکیان ڕادۆڤا، یەکێک لەو چوار منداڵە کە خاوەنی دەموچاوێکی خەنەیی بوو و وەک هێلکەی قەل بە خاڵ خاڵی ورد داپۆشرابوو، پێی گوتم ڕەنگە ئەوان چیدی نەوێرن بگەڕێنەوە بۆ دەرس خوێندن. لە ڕاستیشدا من قسەیەکی وام نەبوو پێی بڵێم، بۆیە ئەگەر کەس وکارەکانیان نەشیانناردبانەوە بۆ خوێندن نە من و نە ئیشماعیلۆڤ غیرەتی ئەوەمان نەدەکرد ڕێگریان لێبکەین چونکە دڵنیا بووین بۆ گرووپی 'تفەنگە ڕەشەکان'، ئەو گرووپەی نەتەوە پەرستانی سرب دایانمەزراندبو و شەوانە وەک تاعوون بە ئاواییەکان وەردەبوون منداڵ و ژن و پیاو هیچ جیاوازیان نەبوو.

لە یەکێک لەو ئێوارە شوومانەی مانگی نیساندا بوو ترس لە چەکدارە نەناسراوەکان هەموو ناوچەکەی داگرتبوو، دوای ئەوەی دەرسەکانمان تەواو کرد، منداڵەکانمان ناردەوە بۆ ماڵەوە. ئەو کاتەی چوار منداڵەکەی گوندی شامالا ئێمەیان بە جێهێشت، لە هەنگاوە بچکۆلەکانیاندا ترس و نیگەرانیەکی پێناسەنەکراو بەدیدەکرا. من لە دوورەوە تارمایی بچکۆلەی ئەوانم دەبینی  جارجار ئاوڕیان دەدایەوە. چوار منداڵ بوون چوار جانتای مۆریان کردبۆ پشتیان کە کتێب و دەفتەر و قەڵەم و کەلوپەلەکانیانی تێدا بوو. چوار منداڵ بوون وەکو چوار فریشتەی بچووک دوور دەکەوتنەوە. ئەوان بۆ ئەوەی گەیشتبانەوە گوندی شامالا، دەبوایە سەعاتێک بە پێ بڕۆیشتنایە و چەند گردۆڵکە و دۆڵ و کێڵگەی گەورە گەورەی گەنم و دانەوێڵە ببڕن کە بە بارانە زۆر و زەوەندەکانی دەشتی سەرایڤۆ بە ئەندازی زینی ئەسپێک بەرز ببوونەوە. ئەو ئێوارەیە دووای ئەوەی منداڵەکانی شامالا ئێمەیان جێهێشت، من و ئیشماعیلۆڤ گەڕاینەوە لای ئەو خانووەی تیایدا دەژیاین. ئیشماعیلۆڤ لە هەیوانی ماڵەکە لە سەر کورسیەکی لە داری گوێز دروستکراو دانیشت و منیش خەریک بووم نەختێک ئالف بدەم بە ئەسپەکەمان. ئەو ئەسپە کوێخای گوندەکە دابوی بە من و ئیشماعیلۆڤ و ڕەنگێکی خورمایی هەبوو. لەو کاتەوەی منداڵەکانی گوندی شامالا

ئێمەیان جێهێشت تا ئالفم دا بە ئەسپەکەمان نیو سەعاتێکی پێچوو. من ویستم لە بەرامبەر ئیشماعیلۆڤدا دانیشم بەڵام پێش ئەوەی دانیشم هەردووکمان بە دەنگی چەند دەسترێژێکی تفەنگ کە لە نێوان گوندی شامالا و گیرڤۆوە هات ڕاچەنین. من و ئیشماعیلۆڤ ڕەنگ بە ڕوومانەوە نەما و بە نیگایەکی مەینەتبارەوە سەیری ناو چاوی یەکترمان کرد و ئیشماعیلۆڤ لە سەر کورسیەکەی کەمێک بەرز بۆوە، بە دەنگێک لە دەنگی ئەو کەسانە دەچوو کە گوللەباران دەکرێن هاواری کرد منداڵەکانی شامالا، منداڵەکانی شامالا و لەگەڵ ئەو هاوارەدا سەرجەم دارو بەردو باخچە و ماڵ و ئەسپ و ژن و درەخت و مزگەوت و ئاسمانی گوندی گیرڤۆ هاواریان کرد منداڵەکانی شامالا، منداڵەکانی شامالا.

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

# دۆڵی فەقێکان

ئەو دەمەی چوار منداڵەکە دەگەنە ئەو دۆڵەی بە 'دۆڵی فەقێکان' ناسرابوو، هەست بە ترسێکی زیاتر دەکەن، ئەمەش لە بەر ئەوەی ئەو دۆڵە داری زۆر بەرز و سامناکی چنار دایپۆشیوەو بە گردەکانی بەرامبەریشیەوە دەوەنی چڕوپڕ وەک کۆمەڵێک دێوی زۆر زەبەللاح هەستاونەتە سەرپێ. منداڵەکان کاتێک دەگەنە ئەو دۆڵە چاویان ڕەشکەو پێشکە دەکات و هەست دەکەن بە کۆمەڵێک دەعبای ئەفسانەیی دەورە دراون. بۆیە ڕادۆڤا لە ترسا بە دەنگێکی نزمی بە ترس تەنراو دەست دەکات بە گۆرانی گوتن. لە پڕ منداڵانی شامالا دەکەونە بەر چەند ڕێژنەیەکی بە سامی گوللەی ئەو پیاوانەی لە بن دەوەنێکدا خۆیان لە بۆسە ناوە. پیاوە چەکدارەکان یەکەمجار لە دوورەوە تارمایی چوار کەسی بچکۆلە دەبینن دڵنیا نابن ئەوانە منداڵن، بەڵام ئەو کاتەی ڕادۆڤا بە دەنگە منداڵانەکەی خۆی بە نوزە نووز گۆرانی دەڵێت چەکدارەکان هیچ گومانیان نامێنێت کە ئەوانە کۆمەڵێک منداڵن. یەکێک لە چەکدارەکان دەڵێت 'ئەوانە زاڕۆکن'، بەڵام چەکدارەکانی تر دەڵێن 'فەرق ناکات'. شەش چەکدارەکە منداڵەکان دەدەنە بەر دەستڕێژ و منداڵەکان وەک کۆمەڵێک

کەروێشک لە کاتی سەربڕیندا دەزریکێنن. ئەو شەوە هەموو خەڵکی گوندەکانی شامالا و گیرڤۆ دەیانزانی منداڵەکانی شامالا کوژراون، بەڵام کەس نەیوێرا لە گوند وەدەرکەوێت. ئەو شەوە هیچ کەس لە گوندەکانی گیرڤۆ و شامالا چاویان نەچۆ خەو. دوای ئەوەی کازیوەش ئەنگوت من و ئیشماعیلۆڤ و چەند پیاوێک بەڕێکەوتین بەرەو شامالا. نیوەی ڕێگاکەمان بڕی تووشی ژن وپیاوەکانی گوندی شامالا بووین کە لە دەوری چوار تەرمی بچکۆلە لە تەڤگەڕدابوون. کاتێکیش گەیشتینە لایان خۆیان بوون، منداڵەکانی شامالا بوون لە ناو کتێب و جانتای دڕاوی قوتابخانە و قەڵەم و دادەری شکاودا کەوتبوون.

یەکەم دەسترێژ بەر جانتاکەی ڕادۆڤا کەوتبوو. جانتاکەی دڕاندبو و کتێب و دەفتەرەکانی پەڕە پەڕە کردبوو. دوای ئەوە شامیل پێکرابوو کە لە دوای رادۆڤاوە ڕۆیشتبوو. سەری شامیل کەوتبۆ سەر کتێبە دڕاوەکانی ڕادۆڤا. لەو کاتەی من گەیشتمە سەریان، سەری شامیل کەوتبۆ سەر هەمان ئەو لاپەڕەیەی وانەی 'هەڵووژە ڕژاوەکان' ی تێدا بوو. گوللەیەک بەر بناگوێی ڕادۆڤا کەوتبو و دەموچاوە خەنەییە خاڵخاڵەکەی سەت هێندەی تر بێگوناهتر دەینواند. ئیبراهیمیش لەکاتێکدا وادەردەکەوت ویستبێتی ڕابکات فیشەکێک لە نێوان هەردو شانە ناسکەکانیەوە بەر گازەرای پشتی کەوتبوو. زاراش، ئەو

کچۆڵەیەی من و ئیشماعیلۆڤ پێمان دەگوت 'تاقانە خوشکی سێ برایان' ڕیزێک گوللە هەردوو قاچەکانیان لە چەند لایەکەوە شکاندبو و پێڵاوە سوورە هەژارانەکانیشی پڕ ببوو لە خوێن. زارا هیچ گوللەیەک بەر بەشی سەرەوەی لەشی نەکەوتبو و پێدەچوو ئەو شەوە بە هۆی خوێن لێڕۆیشتنێکی زۆرەوە مردبێت.

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

هەفتەی دووای ڕەشەکوژی مندالأنی شامالا ئێمە قوتابخانەکەمان نەکردەوە. دوای ئەوەی کردیشمانەوە و ویستمان دەست بکەینەوە بە دەرس وتنەوە بە منداڵەکان، هەرچەندمان کرد نەمانتوانی ئەو کەشوهەوا جەنازەییەی قوتابخانەو گوندو ناوچەکەشی گرتبۆوە تێپەڕێنین. لە ژوورە بچکۆلەکەی پۆلدا چوار جێگا خاڵی بوون. ئیبراهیمۆڤ لای پەنجەرەکەی بەشی دواوەی ژوورەکەی پۆل دادەنیشت و زۆر جار خەیاڵی دەڕۆیشت، ئەو کاتانەش من ئاگادارم دەکردەوە لەوەی پێویستە ئاگای لە دەرسەکە بێت، ئەو بەشەرمێکی نەرمی تێکەڵ بە تەریقبوونەوەوەە زەردەیەکی دەکرد و لە نێوان لێوەکانیەوە ددانە داخوراوەکانی پێشەوەی دەردەکەوت. ڕادۆڤا لە پێشی پێشەوەی لای چەپ دادەنیشت و بە درێژایی وانەکە

دەموچاوە خەنەییەکەی کە بە خاڵی وردوردی لە شێوەی خاڵەکانی سەر هێلکەی قەل داپۆشرابوو، دەبینرا. زارا و شامیلیش خوشک و برا بوون، ئەوان لە ڕیزی ناوەڕاست دادەنیشتن و دنیا گەرم با یان سارد ئەوان بە هەردووکیان مەتارەیەکی زەردی پڕ لە ئاویان لە گەڵ خۆیاندا دەهێنا. ئیتر جێگای هەر چواریان چۆڵ بوو. ئەو کاتەی من و ئیشماعیلۆڤ ویستمان جێگای چۆڵی منداڵانی شامالا بە قوتابیەکانی تر پڕ بکەینەوە بۆ ئەوەی بتوانن بە ئیسراحەت تر دانیشن، بە تەواوی بێئومێد بووین، چونکە قوتابیەکان بەڕادەیەک ترسابوون تەنانەت نەیاندەوێرا لە جێگای خاڵیی کوژراوەکانیش دانیشن. ڕۆژێک من و ئیشماعیلۆڤ بە دورودرێژی قسەمان بۆ کردن و پێمان گوتن کە منداڵەکانی شامالا نەمردوون بەڵکو وەکو کۆمەڵێک پەڕەسێلکە فڕیون بۆ بەهەشت، بەڵام هێشتا قسەکانمان تەواو نەکردبوو یەکێک لە قوتابیەکان گوتی 'نا ئەوان نەفڕیون بۆ بەهەشت، تفەنگە ڕەشەکان ئەوانیان کوشت و باوکم گوتی هەموو گیانیان بە خوێن بووە'.

دوواجار جێگای چۆڵی منداڵە کوژراوەکانمان وەکو خۆی هێشتەوە.

*** *** ***

# ئەو کوڕی خانەدانێک بوو، ئەو بۆسنەییەکی ڕەسەن بوو

هەفتەی کۆتایی مانگی نیسانی ئەو ساڵە بە بەردەوامی شەو و ڕۆژ باران باری. پیاوانی دەمامک بەسەری نەناسراو بە ژمارەی زۆرترەوە لە ناو قوڵایی و چڕی ئەو بارانە بە لێزمانەی مانگی نیساندا دەهاتنە دەر، وەک ئەوەی بەهۆی ئەو بارانەوە هەزاران گەرا بتروکێن و ببن بەو پیاوانەی وەک ڕەوە کوللە دادەڕژانە ئاواییەکان و لە دوای خۆیانەوە پرسە و وێرانی و منداڵانی هەتیو و بێوەژنان و پیاوانی تاسەباریان جێدەهێشت. ئیتر وردە وردە وایانلێهات بەبێ ماسک و بە نوێژی نیوەڕۆ و لە ناو ماشێنی سەربازی زل و تۆکمەدا دەردەکەوتن و بە دنیایەک چەک و چۆڵەوە خۆیان بە سەر ئەو گوندانەدا دەدا کە پڕ بوون لە خەڵکی تۆقیو.

دواهەمین شەوی مانگی نیسان بوو، سەدان ماشێن بە هەزاران سەربازەوە لە گوندی گیرڤۆ نزیک دەبوونەوە. ئەو کاتەی ماشێنەکان گەیشتنە خوار ئاوایی من لە هەیوانی خۆمانەوە بینیمن سەربازەکان لە ماشێنەکان دابەزین و هەموو گیانیان لە ژێر باران و

ڕۆشنایی لایتی ماشێنەکاندا وەک شمشێری جەنگاوەرەکانی تەیمووری لەنگ دەبریسکانەوە. ئەوان هەزاران بوون، بە فیشەکدانی پڕ فیشەک و تەقەمەنی زۆر داپۆشرابوون و لە ناو ئەو تاریکیەوە چاوەکانیان وەک چاوانی هەزاران گورگ تریسکەیان دەهات و گیرڤۆیان گەمارۆ دا. گوندی گیرڤۆ لە ناو گەمارۆی ئەو عەزازیلەدا هەر لە کۆترێکی نەخۆش دەچوو لە ناو هێلانەیەکی بە چەقۆ تەنراو. من و ئیشماعیلۆڤ لە ترسناکی دۆخەکە تێگەیشتین و زانیمان ئێمە هیچمان بۆ ناکرێت. دڵنیا بووین گوندی گیرڤۆ بۆ هەتاهەتایە ڕۆدەچێت و تازە نە ئێمە و نە ئاسمان  ناتوانین گیرڤۆ لەو ئافاتە ڕزگار بکەین. بۆیە بڕیارماندا هەر زوو بە زوو، پێش ئەوەی سەربازەکان لە چوار دەوری گوندەکە جێگیر بن، ڕاکەین. ڕێککەوتین هەندێک کەلوپەلی پێویست کۆبکەینەوە و هەرچۆنێک بێت خۆمان بگەیەنینە ماڵی یەکێک لە دۆستەکانمان لە یەکێک لە ئاواییە نزیکەکانی دەوروبەر. ئەو ماڵە دۆستەی ئێمە دەمانەویست بۆی بچین ماڵێکی سربی بوون، هەروەها دانیشتووەکانیشی هەمووی سرب بوون. ئیشماعیلۆڤ خەریکی کۆکردنەوەی شتەکان بو و منیش خۆم کرد بە تەویلەکەدا بۆ ئەوەی ئەسپەکە زین بکەم. زینی ئەسپەکەمان لە سەری ئەوسەری تەویلەکە لە سەر دوو فەردە جۆ و بەرمیلێکی کۆن دانرابوو

هەڵمگرت و خستمە سەر پشتی ئەسپەکە. ئەسپەکە چەند جارێک بە شێوەیەکی ناعادەتی قاچەکان و سەری و کلکی جووڵاند وەک ئەوەی چاوەڕێی ئەوە نەبێت لە شەوێکی وا درەنگداو لە کاتێکی وادا کە باران خەریکی وێرانکردنی دنیا بوو، زین بکرێت. من ئەسپەکەم هێنایە هەیوانەکەوە و لەگەڵ ئیشماعیلۆڤ سەرو چاکەتێکی سەربەکڵاوی موشەممامان کردە بەرمان کە لە قوماشێک لە شێوەی ئەو قوماشانەی چەتری لێدروست دەکرێت، دروستکرابوو. ئیشماعیلۆڤ سوارچاکتر بوو لە من، ڕێشمەی ئەسپەکەی گرت و سەرکەوتە سەر بەشی پێشەوەی پشتی ئەسپەکە و منیش لە دوایەوە سوار بووم. لە ژێر ئەو موشەممایەی لە بەر خۆم هەڵکێشابوو پێداویستیە سادەکانم لە بوخچەیەکدا لە پشتم گرێدابوو. بە هێواشی لە دەرگای حەوشە هاتینە دەرو پشتمان کردە ماڵە بچکۆلەکەمان، ماڵێک کە ساڵێکی تەواو تێیدا ژیابووین. بە ناو قوڕی خەستی کۆڵانەکەدا کە تا کەمێک خوار ئەژنۆی ئەسپەکە دەهات بە ژێر بارانێکی بەخوڕدا تێپەڕین و ئیشماعیلۆڤ ڕووی ئەسپەکەی کردە لای سەرووی ئاوایی، دیار بوو پێمان وابوو سەربازەکان جارێ نەگەیشتوونەتە ئەوێ و ڕکێفی لێدا.

مەودایەکی باش لە ئاوایی دوورکەوتینەوە، بەڵام خێڵی کوللەکان بە هەزاران لەو دەشت و دەرە و لە ژێر باراندا بڵاوببونەوە. هەموو

هەوڵی ئێمە ئەوە بوو خۆمان بگەیەنینە گوندی مارسا. مارسا گوندێک بوو هەموو دانیشتوانەکەی سرب بوون و ئێمە لەوێ دۆستێکی نزیکمان هەبوو پێمان وابوو دەتوانێت بمانشارێتەوە. بە تایبەت شاردنەوەی ئیشماعیلۆڤ کە لە بنەماڵەیەکی موسوڵمان بو بۆ من زۆر گرنگ بوو. من گومانێکم لەوە نەبوو هیچ کەسێکم لە گوندی گیرڤۆ بۆ نەجات نادرێت، بۆیە زۆر هەوڵمدەدا ئیشماعیلۆڤ نەجاتدەم.

لە پڕ ئێمە کەوتینە بەر لایتێکی زۆر بە هێزی ڕووناکی کە لە دوورەوە ئاراستەمان کرا. سەرچاوەی ڕۆشناییەکە کۆمەڵێک سەربازی دێدەوانی بوون و چاودێری ئەو دەشتەیان دەکرد. ئیتر ئێمە ئاشکرا بووین و ڕۆشنایی لایتەکە چەند جارێکی تر ئاراستەمان کرایەوە و بە دەنگوهەرا و غەڵبەغەڵبی دوری سەربازەکان تێگەیشتین ئەوان دووامانەدەکەون. ئیشماعیلۆڤ ڕیشمەی ئەسپەکەی شلکرد و بە نادڵنیایەوە گوتی:

" ئێمە ناتوانین دەرباز بین بەو ئەسپە. سەربازەکان پێمان دەگەنەوە. بۆیە باشتر وایە ئەسپەکە بەرەڵلاکەین و خۆمان لە ناو ئەو گیاو دارو دەوەنەدا بشارینەوە"

"باشە" من بە کزی و مەلوولی و نادڵنییایەکی بێچارانەوە ئەوەم گوت.

ئەسپەکەمان وەستاند و خۆمان فڕێدایە خوارەوە. کەمێک لە ئەسپەکە دوورکەوتینەوە و ئەسپەکە لە ناو تاریکاییەکەوە بە ناحاڵیبوونەوە سەیری دەکردین. بە ناو دارودەوەن و گژوگیای تەڕی ئەو بەهارەدا ڕامانکرد. لقی دەوەنەکان بەر دەموچاومان دەکەوت و گژوگیا لە قاچ و قولمان دەئالا. لە گردێکی بچووک ئاوابووین و لە ناو مەزرایەکی گەورەدا تووشی مەڵۆیەکی زۆر گەورەی گیا بووین کە جووتیارەکان درووبوویان بۆ ئەوەی ووشک ببێتەوە و لە وەرزی هاوین و بێگژوگیاییدا بیدەن بە ئاژەڵەکانیان. من و ئیشماعیلۆف خۆمان کرد بە ژێریداو بە تەواوی خۆمان داپۆشی بەو ئومێدەی سەربازەکان نەماندۆزنەوەو هەرکاتێک دوورکەوتنەوە ئێمە هەوڵبدەین بە پێ خۆمان بگەیەنینە گوندی مارسا.

ئەو شەوە سەربازەکان هاتنە سەر سەرمان. ئێمە هەموو گیانمان تەڕ ببو و لە سەرماو لە ترسا لە ژێر ئەو مەڵۆ زلەی گیادا دەلەرزین. ئەوان ماوەی زیاتر لە سەعاتێک لەو دەوروبەرە هاتن و چوون و ئێمەیان نەدۆزیەوە.

"من دڵنیام هەر لەو نزیکانەن" سەربازێک بە دەنگێکی گڕەوە ئەوەی گوت.

دوواتر بە دەنگە دەنگەکە هەستمانکرد سەدان سەربازی تر هاتوونەنەتە ئەو دەوروبەرە. من و ئیشماعیلۆڤ سەرتاپای گیانمان ترس و تەڕی داپۆشیبوو، لە ژێر ئەو هەموو گیایە، بە ڕادەیەک هەستمان لە خۆمان بڕیبوو کە پێمان خۆش بوو دڵمان وەستابا نەبادا گوێیان لە ترپە ترپی لێدانە توندەکانی بێت. لەو ترس و نادڵنیاییەدا بووین لەپڕ مشە مشی چەند سەگێک هاتە گوێمان و ئیتر هەر هێندەمان زانی لە سێ شوێنی جیاوازەوە لووتە تیژەکانی سێ سەگ بەناو گژوگیاکەدا هاتە سەر سەرمان. ئێمە زیاتر خۆمان بێدەنگ کرد و کەمێک خۆمان گرمۆڵەتر کرد، بەڵام سەگەکان کە بۆ ڕۆژێکی ئاوا ڕاهێنرابوون، هێندەی تر سەریان گەرم بو و بە دەستە بۆرەکانیان گیاکانیان لەسەر لادایین. دوو سەگیان ملی من و ئیشماعیلۆڤیان گرت و سەگەکەی تر دەستێکی لە سەر پشتی من و دەستەکەی تری لە سەر پشتی ئیشماعیلۆڤ دانا. ئێمە وەک دوو نێچیری بێچارە کەوتینە ناو گەمارۆی سەدان سەربازەوە. چەند سەربازێکیان دیار بوو لە شەوی ڕابردووەوە بە هۆی ئێمەوە ماندوێتیان زۆر چەشتبوو، زۆرتر لێمان پەست بوون، لێمان هاتنە پێش و سەگەکانیان لێ دوورخستینەوە. کازیوە کەوتبو و ئێمە

بەهۆی سەرما و ماندوویی و ترسی زۆرەوە وەک پەلاسمان لێهاتبوو. غەڵبە غەڵب و قریوەی پێکەنینی سەدان سەرباز وەک ئەوەی ناپلیۆنیان بە دیل گرتبێت هێندەی تر نیگەرانی کردبووین. چوار لەو سەربازە تووڕانەی کە سەرتاپای دوێنێ شەو بە دووای ئێمەوە ببوون لێمان هاتنە پێش و پشتی ملمانیان گرت و بە ناو گیای تەڕی ئەو سپێدەیەدا وەک دوو کەلاک ڕایانکێشاین بۆ بەردەم ئەفسەرێکی پایەبەرز. ئەو ئەفسەرە دیار بوو فەرماندەی هەموویان بوو. کاتێک گەیاندیانینە بەردەم کابرای ئەفسەر کە سمێڵێکی وەکو سمێڵی فاشیستەکانی هەبوو، من و ئیشماعیلۆڤ ئەژنۆکانمان دەلەرزین.

"موحەممەدیەکان، پێتان وابوو لە دەستمان دەردەچن؟" کابرای ئەفسەر نەڕاندی.

ئێمە سەرمان نابۆ بەر خۆمان وقسەمان نەکرد.

ئەو جارێکی تر هاواری کرد و گوتی " شەوی دوێنێ شەو سەدان سەرباز بەدوای ئێوەوە بوون، چی دەکەن لێرە؟ بۆ قسە ناکەن؟"

من هەرچۆنێک بوو هەوڵمدا غیرەتم دایە بەر خۆم و بە دەنگی کەسێکەوە کە تاوانێکی گەورەی کردبێت گوتم" قوربان ئێمە مامۆستاین لە گوندی گیرڤۆ و هیچ گوناهێکمان نەکردووە"

"ئەدی خێرە ئەو دەشتە پان و بەرینەتان بە سەربازەکانم گێرە کردووە؟ یان ویستتان ڕابکەن بۆ ناو جەردە و ڕێگرە ئەلبانیەکان؟" کابرای ئەفسەر کاتێک ئەو قسانەی کرد، پێکەنینێکی گاڵتەجاڕیانە پێمان پێکەنی.

"بەڕێز ئێمە تەنیا دوو مامۆستای بێگوناهین، نە کارمان بەسەر سربەکانەوە هەیە نە ئەلبانەکان" من بە لێوەلەرزەوە ئەوەم گوت.

کابرای ئەفسەر ڕووی کردە کۆمەڵێک سەرباز کە لە لای چەپیەوە وەستابوون، لێیان نزیک بۆوە و بە دەنگێک کە من و ئیشماعیلۆڤ تێنەگەیشتین باسی چیدەکەن کەمێک گفتوگۆیان کرد.. ئیتر کابرای ئەفسەر لە گەڵ چەند سەربازێک سواری ماشێنێکی بچووک بوون و ڕۆیشتن.

هەر کە ئەفسەرەکە دوورکەوتەوە زیاتر لە سی سەرباز لە دەوری ئێمە کۆبوونەوە. کۆمەڵێکیان پەلاماری منیان دا و کۆمەڵێکی تریش هی ئیشماعیلۆڤ. هێند بە گوڕ تاویاندایە ئێمە خۆشمان نەمانزانی

چۆن و بەچی خێراییەک پانتۆڵەکانیان لە پێ داکەندین. سەیری ناو گەڵی ئیشماعیلۆڤیان کرد و بینیان خەتەنە کراوە، هەموویان وەک ئەوەی دێوانە بووبن هاواریان دەکرد" موحەممەدی، موحەممەدی". من تێگەیشتم ئەوانە سەر بە 'تفەنگە ڕەشەکان'-ن و ئەگەر دڵنیا نەبن کەسێک موسوڵمانە ئەوا ڕووتی دەکەنەوە تا بزانن خەتەنە کراوە یان نا. وەک کۆمەڵێک کەس کە لە سرووتێکی دینیدا بن بە سەرگەرمیەکی زۆرەوە دووان دوان و سیان سیان چوونە سەر دەست و قاچی ئیشماعیلۆڤ و جووڵەیان لێبڕی. یەکێک لە سەربازەکان سونگیەکی لە بەر کەمەری خۆی دەرهێنا. سونگیەکەی دەمێکی درێژ و پشتێکی کڕکڕاگەداری هەبو. سەربازەکە کە دانەکانی هەمووی زەرد وپیس بوون ڕێک ڕۆیشتە نێوان هەردوو قاچە کراوەکانی ئیشماعیلۆڤەوەو بە جووڵەیەکی خێراو لە ماوەیەکی یەکجار کورتدا کێروگونی ئیشماعیلۆڤی لە بنەوە بڕی. ئیشماعیلۆڤ هاوارێکی جەرگبڕی لێهەستا و هەستمکرد ئیتر لە هۆش خۆی چوو. دوواتر دوو سەرباز وەک ئەوەی شتێکی پیس فڕێبدەن لە قاچی ئیشماعیلۆڤ نەوین و بەدوای خۆیاندا ڕایانکێشاو فڕێیاندایە ناو خەرەندێکی گەورەی ئەو نزیکانە. ڕێک لەو کاتەدا بارانێکی بە خوڕ دایکرد. ئینجا دووای ئەوەی بینیان من خەتەنە نەکراوم، بە قۆنداخی تفەنگە قورسەکانیان کەوتنە گیانم. من تەنیا چەند لێدانی یەکەمم ئاگا

لێبوو. هۆشم لەوە نەما دووای ئەوەی بە لێدان دەمبورێننەوە بە چووار سەرباز فڕێمدەدەنە ناو عەرەبانەیەکەوە کە ماشێنێکی سەربازی ڕایدەکێشێت. هەروەها ئاگام لەوەش نەببوو کاتێک سەربازەکان لە نەخۆشخانەیەکی بچوکی شارۆچکەیەک دامدەگرن خۆیان دەڕۆن.

***　　　***　　　***

# هەڵسانەوەی ئیشماعیلۆڤ

چاوم لێیە ئێوارەیەک ئیشماعیلۆڤ وەک خودایەکی ناو ئەفسانە گریکیەکان لە مەرگی خۆی ڕاست دەبێتەوەو بە قاچ و ڕانی خوێناویەوە لە خەرەندەکە دێتە دەرەوە. بە ناو گژوگیای ئەو بەهارە تەڕەی دەشتی سەرایڤۆدا دەڕوات. من نازانم ئەوە ئیشماعیلۆڤ خۆیەتی یان تارماییەکەیەتی دەچێتە ناو گوندی مارساوەو لە دەرگای یەک بەیەکی ماڵەکان دەدات. بە کۆڵانەکانی ئەو ئاواییەدا دەگەڕێت و هاوار دەکات " خەڵکینە ئەز غەریبم زامەکانم تیمار کەن". بەڵام کەس دەرگا لەو بۆسنەییە ڕەسەنە ناکاتەوە. گەنجێک، گەنجێتی خۆی دەکاتە قوربانی و ژیانێکی زاهیدانە هەڵدەبژێرێت تا دەرس بە منداڵان بڵێتەوە. کەس گوێ ناداتە ئەوەی ئیشماعیلۆڤ کوڕی پیاوێکی خانەدانە و بنەماڵەکەیان سەدان خێزانی سربیان لە گرانیەکەی جەنگی جیهانی دووەمدا لە مەرگ دەرباز کردووە. ئەو شەوەی ئیشماعیلۆڤ بە لاڕانی خوێناویەوە دەرگا بەدەرگای ماڵان دەکوتێت و کەس دەرگای لێناکاتەوە ڕێک بە ڕێگای خۆیدا دەگەڕێتەوە بۆ ناو خەرەندەکە و لە هەمان شوێنی خۆی پاڵدەکەوێتەوەو وەک پیاوێکی بە حورمەت مەرگی خۆی قبوڵدەکات

و دان بە ناکەس بەچەیی دنیادا دەنێت. چل ڕۆژی ڕەبەق تەرمی ئەو گەنجە شەرمنە لە بەر باران دەبێت، تا ڕۆژێک لافاوێکی گەورە هەڵدەستێت و تەرمی هەڵئاوساوی ئیشماعیلۆڤ دەخاتە سەر پشتی خۆی بۆ ئەوەی لە دەریادا بینێژێت. تەرمی بێناز و هەڵئاوساوی مامۆستایەکی گەنج بەرەو دەریا بەڕێوە دەبێت. کەس لە دوای جەنازەی ئیشماعیلۆڤەوە ناڕوات، بەڵام ڕۆحی دەربەدەری منداڵانی شامالا بە ناو دەغڵەکاندا لە قەراخ خەرەندەکەوە دوای دەکەون.

❋❋❋ ❋❋❋ ❋❋❋

# کچەپەرستارەکە

دووای ئەوەی لە نەخۆشخانە هۆشم هاتەوەبەر تێگەیشتم جگە لە چوار پەراسووم، دەستێکم لە دوو جێ شکێنرابو و کلاوەی ئەژنۆی ڕاستیشم دەرچووبوو. هەموو گیانیشم لە ژێر زەبری لێدانە توندەکانی قۆنداغی تفەنگی سەربازەکان کوترابوو. دوای ئەوەی من وردە وردە بەرەو چاکبوونەوە دەڕۆیشتم، هەموو دووشەممان دەبوایە بە یاوەری پۆلیسێک سەردانی بنکەی لێکۆڵینەوەم کردبایە و ئیمزام کردبا وەک بەڵگەی ئەوەی من هێشتا لە بندەستیاندام. دەستەیەک لەو ژنانەی بە خۆیان دەگوت "خوشکانی تێریزا" جاروبار سەردانیان دەکردم. ئەو ژنانە بە نەخۆشخانەکاندا دەگەڕان و ئینجیلیان بە سەر ئەو نەخۆشە بێچارانەدا دابەش دەکرد کە جگە لە ئینجیل پەنایەکی تریان لە ژیاندا بۆنەمابۆوە. یەکێک لە پەرستارەکان کچێکی مناڵکارەی بەژن باریک بو و لە هەموو پەرستارەکانی دیکە زیاتر بایەخی پێدەدام، زۆربەی کاتە بەتاڵەکانی خۆی لای من بەسەر دەبرد و ئاشنایەتیەکەمان بە ڕادەیەک ڕۆیشتە پێشەوە کە من سەرلەبەری چیرۆکی خۆم و ئیشماعیلۆقم بۆ گێڕایەوە. بۆیە ئەویش جارجارە بە نیمچە سوعبەتێکەوە، لەو

سوعبەتانەی ئینسان دەبێت بە ڕاستی وەریانگرێت دەیگوت "ماڵوێران ئەگەر ئەو پارچە چەرمەی ناوگەڵت نەبوایە ئێستا دەبوایە بۆ لاشەکەت بگەڕێین".

من هەموو شتێکم لە بەرچاوکەوتبوو. خەمی کوژرانی ئیشماعیلۆڤ بەشێوەیەکی وا بێڕەحمانە و بڕینی کێر وگونی بە تەواوی وڵاتەکەمی کردە شتێکی بێزراو لە بەرچاوم. من تەنانەت لە بەردەمی ئەو پۆلیسە خەسیوو دەبەنگانەی لێکۆڵینەوەشیان لەگەڵدا دەکردم نەمدەتوانی نەفرەت و قێزی خۆم بشارمەوە، بەڵام ئەوان هەر سوور بوون لەسەر ئەوەی من سربێکی نمەک بەحەرامم و هاوکاری گرووپێکی چەکداری ئەلبانیم کردووە دژی سربەکان. من دەمگوت مامۆستام و ئەوان دەیانگوت تۆ سیخوڕیت.

کچە پەرستارەکەی ئاشنام بۆی باسکردم کە ئەو شەوەی من و ئیشماعیلۆڤ ڕامانکردووە، سەربازەکان سەرجەم دانیشتووانی گوندی گیرڤۆ و شامالایان لە ناو تەلبەندێکی گەورەدا کۆکردۆتەوە و بە تەواوی ڕاپێچی ناوچەیەکی دوور کراون، بەڵام ئەو ناوچەیە کوێیە؟ کەس نازانێت. هەر ئەو کچە باسی ئەوەشی بۆ کردم حکومەت دوای ئەوەی دانیشتووانی ئەو دوو گوندەی ڕاپێچی ناوچە دوورە نەزانراوەکان کردووە، یەک بە یەکی ماڵەکانیشی تەختی

زەوی کردووە. دواتر دەزگا لێپرسراوەکان ناوی ئەو دوو گوندەیان لە هەموو فایل و دۆکومێنتەکانی حکومەتدا سڕیوەتەوە و ئێستا هیچ گوندێک بەو دوو ناوەوە نین.

دوای کوشتاری منداڵانی شامالا و کوشتنی ئیشماعیلۆڤ و سڕینەوەی دوو گوند بە سەرجەم دانیشتووان و مەڕوماڵات و زیندەوەرانیەوە لە سەر نەخشە، من تێگەیشتم تازە هیچ شتێک ئەو وڵاتە دەرباز ناکات. تێگەیشتم هیچ شتێک بە من ناکرێت. تێگەیشتم هیچ شتێک و هیچ کەسێک بە من دەرباز ناکرێت. بۆیە بیرم لەوە کردەوە خۆم دەرباز کەم. ئەو کاتەی بیرۆکەی خۆ دەربازکردنیشم بۆ کچە پەرستارەکەی ئاشنام باسکرد، ئەو زۆر پێی خراپ نەبوو، بەڵام پێدەچوو ئەو حەز بکات زۆرتر من گلبداتەوە.

شەوێک دووای ئەوەی چوار مانگ بوو من لەو نەخۆشخانەیە بووم – کە تاڕادەیەک دەستبەسەر بووم – بە دورودرێژی نەخشەمان بۆ ڕاکردنی من دانا. ئەو پێی گوتم کە زۆر حەز دەکات لە گەڵ من ڕابکات بەڵام دڵی نایات دایکە کوێرەکەی بە تەنیا جێبهێڵێت، بەڵام ئەو بەڵێنی پێدام یارمەتیم بدات. وەک یەکەم هەنگاو بۆ هەڵاتنەکەم ئەو پێشنیاری کرد بە دزیەوە نەخۆشخانە جێبهێڵم و ئەو لە ماڵی خۆیان حەشارمدات. ئینجا دوواتر، ئەو کاتەی چیرۆکی ڕاکردنەکەم

کەمێک کۆن دەبێت کەسێک ئەدۆزێتەوە تا ڕێنماییم بکات لە سنوور بپەڕمەوە و بڕۆم بۆ ئەلبانیا و لەوێشەوە بەرەو ئیتالیا. من پێشنیارەکەی ئەوم قبووڵ کرد لە بەر ئەوەی عەقڵ دەیگرت، جگە لەوەش من ڕێگایەکی ترم شک نەدەبرد.

شەوێکی تاریک بوو لە شەوەکانی سەرەتای مانگی سێپتەمبەر. پەرستارەکە دەرگای پشتەوەی حەوشەی نەخۆشخانەکەی نیشاندام. ئەو دەرگایە بەسەر باخچەیەکی بچوکدا دەکرایەوە و لە وێشەوە ڕێک دەمتوانی خۆم بکەم بە ناو ماڵەکانی ئەو شارۆچکەیەدا، بەڵام ڕێککەوتین شەوی ڕاکردنەکەم شەوێک بێت کە ئەو کچە خۆی پەرستاری ئێشکگر نەبێت و بگرە ئەو لەو شەوەدا هەر لە نەخۆشخانەکەش نەبێت بۆ ئەوەی هیچ گومانێک لە سەر ئەو دروست نەبێت.

سێ شەو دوای ئەو شەوە، نزیکەی سەعات سێی بەری بەیانی، لە کاتێکدا پاسەوان و پەرستارەکان خەوتبوون، دزەم کردو بۆی دەرچووم. ئەوەی ڕاکردنەکەشمی ئاسانتر کرد ئەوە بوو کە من چوار مانگ بوو لەو خەستەخانەیە بووم و تاڕادەیەک دڵنیا ببوون لەوەی هەڵنایەم. جگە لەوەش کاتی ڕاکردنەکەشم سەر لە بەیانیەکی

زۆر زوو بو و لەو کاتانەدا بە گشتی پاسەوان و پەرستارەکان بێخەمتر بوون چونکە پێیان وابوو تازە ئیتر دەمەدەمی سپێدەیە.

کاتێکیش لە باخچە بچووکەکەی پشتەوەی حەوشەی خەستەخانەکە ئاوابووم، هەر وەک پێشتر ڕێککەوتبووین، کچە پەرستارەکە چاوەڕێی دەکردم. من بە کەمێک هەناسەسواریەوە گەیشتمە لای و بەبێ ئەوەی هیچ کامێکمان قسەیەک بکەین ئەو پێشم کەوت. دوای ئەوەی بە پشتی شارۆچکەکەدا بە نزمی و بۆ خۆ پاراستن لە گڵۆپەکانی بنکەکانی دیدەوانی ڕۆیشتین، خۆمان گەیاندە ماڵی ئەوان. ماڵەکەی ئەوان زۆر لە نەخۆشخانەکەوە دوور بوو.

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

کاتێک گەیشتینە ماڵی پەرستارەکە دایکە نابیناکەی خەوتبوو. بۆیە پەرستارەکە بە منی گوت پێویستە هێواش بجوڵێمەوە چونکە دایکی خەوی زۆر خراپە - هەر خەبەری ببێتەوە حەزرەتی موساش ناتوانێت بیخەوێنێتەوە. بۆ ئەوەی هیچ جۆرە گومانێک لای کەسانی ناسیاوی ئەو ماڵەو دەرودراوسێکانیان دروست نەکەم، کیژەی پەرستار ڕێنمایی کردم بۆ ناو ژورێکی بچووک. ئەو بەو ژوورەی

دەگوت ژووری کەروێشکەکان و پڕ بوو لە دەیان کەروێشکی گەورە و بچووک. کیژەکە دۆشەکەڵەیەکی لە گەڵ پەتۆیەک و سەرینێک بۆ هێنام و لە ناو پوشوپەڵاش کە بۆ یاری و ئیسراحەتی کەروێشکەکان دانرابوو جێگاکەی بۆی داخستم. دوواتر مۆمێکی بۆ هێنام و دایگیرساند. ئینجا پێی گوتم هەرشتێکم ویست بە دەست بکێشم بە دیوارەکەدا و ئەو خۆی دێت بۆ لام. ئەوەشی پێگوتم خەمی سەرمام نەبێت چونکە ژوورەکە هەر خۆی گەرمە و هەناسەی ئەو هەموو کەروێشکە زۆرەش گەرمتری کردووە.

کەروێشکەکان ئەو دەمەی منیان بینی لەوێ پاڵمدایەوە هەموویان بە زیکە زیک خۆیان خزاندە کونەکانیانەوە. دەیان کەروێشکی ڕەنگاوڕەنگ بوون. هەندێکیان هەمووی چەند ڕۆژێک بوو لە دایک ببوون و هەر یەکەیان هێندەی هێلکەی مراویەک دەبوون. نازانم هۆی چی بوو دڵنیا بووم کەس ناتوانێت بمدۆزێتەوە، بۆیە هیچ ترسم نەبوو، بەڵام زۆر ماندوو بووم. هەر سەرم کردە سەر سەرینەکە کە بەهۆی پوشوپەڵاشەکەی ژێری خشەخشێکی لێهەستا، خەوم لێکەوت. ماوەیەک لە ماڵی کچەی پەرستار مامەوە، ئینجا بە هاوکاری ئەو خۆم گەیاندە سەر سنوور و ئەو کاتەش لە سنوور ئاودیو بووم چەند قاچاخچیەکی ئەلبانی چاوەڕێیان دەکردم. چۆنیەتی مامەڵەی دڕندانەی ئەو قاچاخچیە ئەلبانیانە و ئەو

چەرمەسەریانەی تووشیان بووم کاتێک ئەوان بە بەلەمێکی ماتۆڕی یەکجار تیژڕەو پەڕاندمیانەوە بۆ بەری ئیتالیا چیرۆکێکی سەربەخۆیە و من لێرەدا ناتوانم باسی بکەم. پاش ئەوەی لە ئاوەکە هاتمە دەرەوە و لە دەست ئەلبانیەکان نەجاتم بوو، هێڵنجێکی زۆرمدا، بەڵام ئەو هێڵنجانە پەیوەندییان بەو برسێتی و شڵەژانی گەدەیەوە نەبوو کە هەموو کەسێک لە ناو دەریادا تووشی دێت، بەڵکو ئەو ڕۆژە من هەر بەڕاستی قێزم لە مرۆڤ دەبۆوە. ئەو هێڵنجانە بەریان نەدام تا ئەو بەری بەیانە زووەی لە ڤینیسیا بۆ یەکەمجار لاسم بینی.

*** *** ***

# من و میلیاس

بابی من و دایکی میلیاس دووانە بوون. ئەو ساڵەی ئەوان لە دایک دەبن هەمان ساڵ دەبێت ئیلیزابێسی دووەم دەبێت بە شاژنی بەریتانیا و بەمەش زۆربەی وڵاتانی کۆمۆنوێڵس دەکەونە ژێر سێبەری تاجەکەیەوە. شاژن، بۆ پیشاندانی هەیبەت و شکۆی خۆی خەڵاتی هەموو ئەو دایکانە دەکات کە لەو ساڵەدا منداڵیان دەبێت. بەو هۆیەوە نەنکم جگە لە میداڵێکی شاهانە بڕێک پارەی نەختیش وەردەگرێت. دووای بابم و دایکی میلیاسیش وردە وردە گەورە دەبن زۆربەی کاتەکان بەیەکەوە بەسەر دەبەن. ئەو کاتەی گەنج دەبن ڕۆژێک سەردانی پیشانگایەکی تایبەتی دەکەن. ئەو پیشانگایە تایبەت دەبێت بە پیشاندانی کارەکانی ئەو بزوتنەوە هونەریەی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەی بەریتانیا واتە بزوتنەوەی پریڕافایلیەکان. یەکێک لە تابلۆکانی 'جۆن ئیڤرێت میلیاس' بە ناوی ' ئۆفیلیا' زۆر سەرنجیان ڕادەکێشێت. پیشانگاکە سێ ڕۆژ بەردەوام دەبێت و ئەوان هەر سێ ڕۆژەکە دەچن بۆ بینینی هەمان تابلۆ. ئەو خوشک و برایە بەچەندان سەعات سەیری ئەو تابلۆیە دەکەن. لەو تابلۆیەدا کچێک بە ناوی ئۆفیلیا وەک ئەمیرەیەک بە شکۆیەکی

شازادانەوە بە خنکاوی لە ناو ئاودا ڕاکشاوە. هەر ئەو ڕۆژەش دەبێت بابم و پوورە ڕێبیکام بەڵێن دەدەن ئەگەر هەر کامێکیان کوڕێک یان کچێکیان هەبێت ناوی میلیاس یان ئۆفیلیای لێدەنێن. کاتێکیش من لە دایک دەبم بابم بەڵێنەکەی خۆی دەباتە سەر و ناوی ئۆفیلیام لێدەنێت هەر وەک چۆن پوورە ڕێبیکاشم ناوی نۆبەرەکەی خۆی دەنێت میلیاس.

پەیوەندی من و میلیاس پەیوەندیەکی سەیر بوو. من بەڕاشکاوی دەتوانم بڵێم لەوەتەی بیرم دێت من ئەو کوڕەم هەر خۆشویستووە، بەڵام زۆر جار نەمدەتوانی ناوێکی دیاریکراو لە سەر ئەو خۆشەویستیەی من بۆ ئەوم هەبوو، دانێم. تەنانەت هەندێک جار هەستم دەکرد ئەو برایەکی دووانەی خۆمە. بەڵام ئەوەی منی بۆ یەکجاری دڵنیا کرد کە ناکرێت میلیاس برام بێت ئەو ڕووداوە بوو کە چەندان ڕوداوی هاوشێوەی تریشی بەدوواداهات.

ڕۆژێکی هاوین بوو لە هاوینە خۆشەکانی ئینگلاند. ئەوسا تەمەنم سیانزەساڵان بوو. بەیانی زوو بە ئازارێکی کەم لەسەر هەردوو لای ڕاست و چەپی سنگم بە خەبەر هاتم. هەستم دەکرد مەمکەکانم کەمێک پەنماون و کراسە تەنکەکەمیان زیاتر لە ڕۆژانی تر بەرزتر کردۆتەوە. ئیتر نیوەڕۆکەی میلیاس هات بۆماڵمان و من و ئەو

پێکەوە یاری میکانۆمان دەکرد. من بە میلیاسم  گوت هەردوو لاکانی ڕاست و چەپی سنگم ژان دەکەن. ئەو بە هێواشی کراسە تەنکەکەمی تا ژێر ملم بەرز کردەوە و وەک ئەوەی دەست بێنێت بە پشتی زەڕنەقوتەیەکدا، هەردوو دەستەکانی هێنا بەسەر مەمکەکانمدا کە تازە لە شکۆفە کردندا بوون. ئەو کاتەی میلیاس وای کرد من شەرم دایگرتم و هەستم بەخۆشیەکی لە ڕادەبەدەر کرد، بەڵام لەبری ئەوەی خۆم بدەمە دەست ئەو چێژەی لە دەست لێدانەکەدا هەبوو، وام پیشاندا ئازارێکی توندم هەیە و گوتم "ئای... ئای". بەڵام میلیاس وەک هەموو کوڕان ساختەچی بو و گوێی نەدایە ئەوەی من چی دەڵێم، بەڵکو دوای هاواری ئەو غەریزەیە دەکەوت کە منی لە ناوەوە لغاو کردبوو. ئاخر ئێمەی کچان هەمیشە لە ناوەوە هەستێکمان هەیە و بە دەم شتێکی تر دەردەبڕین. ئێمەی کچان قەت حەز ناکەین کوڕان بەپێی ئەوە ڕەفتار بکەن کە ئێمە دەیڵێین، بەڵکو پێمان خۆشە کوڕان بە دەم هاواری ناوەکی ئێمەوە بێن، بەڵام کوڕانیش ئەوە دەزانن بۆیە قەت نائومێدمان ناکەن. کوڕان وەکو سەگی ڕاو بەهەستن. زۆر جاری تر میلیاس دەیویست دەست لە شوێنێکی لەشم بدات من دەمگوت وامەکە میلیاس، وامەکە میلیاس، بەڵام من درۆم دەکرد، من لە ناوەوە دەمگوت وابکە میلیاس، وابکە

میلیاس. میلیاسیش بە هەستی کوڕانەی خۆی ئەوەی دەزانی بۆیە هەمیشە وایدەکرد.

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

# دەنکەهەنار

لاس ڕۆژ بە ڕۆژ ناوبانگی وەک شاعیرێکی بە توانا زیاتر بڵاو دەبێتەوە. خەڵکێکی زۆر دەیناسێت و شیعرەکانی دەم بە دەم و دەست بە دەست دەگەڕێن، بەڵام ناوبانگ و ناسرانی وەک شاعیرێک هیچ لە ژیانی پڕ چەرمەسەری ئەو ناگۆڕێت. ئەو کاتەش عاشقی کچێکی گەنجی یەکێک لە گەڕەکەکانی شار دەبێت بە ناوی دەنکەهەنار خەمێکی زۆر دەخوات بەوەی دڵنیایە ناتوانێت بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێت کچەکە دڵخۆش بکات. ئەوەی زیاتریش ئەو عەشقە ناکام دەکات ئەو ئامۆزا دڵڕەقانەی کچەکەن کە بە وەخت و ناوەخت لە ماڵی کچەکە دەردەکەون.

دەنکەهەنار کچی بێوەژنێک بوو و باوە پیارەیەکی هەژار و سێ خوشکی لە خۆی گەورەتری هەبوو. هەر سێ خوشکەکانی دەنکەهەنار شوویان کردبوو تەنیا خۆی نەبێت کە لەگەڵ دایکی و باوە پیارەکەیدا دەژی. ڕۆژێک دەنکەهەنار بۆ لاسی باسدەکات ئەوەی ئەو توانیویەتی تەنگ بە ئامۆزا دڵڕەقەکانی هەڵبچنێت. دەبێت ئەوە بزانین دایکی دەنکەهەنار کۆمەڵێک زەوی و زاری بە میرات لە لایەن باوانیەوە بۆ جێماوە، بەڵام برازاکانی مێردەکەی پێشووی

دەستیان بە سەردا گرتووە. ئەو کاتەی دەنکەهەناریش گەورە دەبێت هەم بە هۆی هەژاریەوە و هەم بە هۆی ئەوەی هەست دەکات ئەوان غەدریان لێکراوە بە توندی ئامۆزاکانی ئاگادار دەکاتەوە لەوەی ئەوانیش بەشیان لەو موڵک و زەویانەدا هەیە. دەنکەهەنار ئامۆزاکانی ئاگادار دەکاتەوە لەوەی ئەگەر بەشی خۆیان لەو موڵکانە بۆ نەگەڕێننەوە ئەوا ئەو سکاڵایان لەسەر تۆمار دەکات و کێشەکە دەگەیەنێتە دادگا. ئامۆزاکانی لە سەرەتادا دەیانەوێت بە هەڕەشەو گوڕەشە کچە مامەکەیان بێدەنگ بکەن، بەڵام کاتێک دەبینن هەرەشەکانیان بێسوودە بە تەواوی دەهری دەبن و لە دەرفەتێک دەگەڕێن بۆ هەتا هەتایە دەنکەهەنار بێدەنگ بکەن.

ڕۆژێکی گەرمی هاوین، یەکێک لەو ڕۆژانەی گەرمی ئەربائیللۆ دەگاتە ڕادەیەک کە ئینسان هەست دەکات خەڵکی ئەو شارە لەلایەن خوداوەندەوە بەر سزا و نەفرەتێکی ئەبەدی کەوتووە. لە یەکێک لەو ڕۆژانەدا، یەکێک لە ئامۆزاکانی دەنکەهەنار، لە پەنا چەند سنەوبەرێکی تۆزاوی سووچی پارکێکی فەرامۆشکراودا دەنکەهەنار لەگەڵ لاسدا دەبینێت. ئەو ڕۆژە ئامۆزاکەی دەنکەهەنار هیچ قسەیەک ناکات و ڕێک دەگەڕێتەوە ماڵەوە وئەوەی بینیویەتی بۆ ئامۆزاکانی تری دەگێڕێتەوە. بۆ هەفتەی داهاتوو کاتێک دەنکەهەنار و لاس بڕیار دەبێت یەکتر ببینن، دەنکەهەنار ئامادە نابێت، بەڵام

لاس هیچ ئاگای لەوە نییە تەنیا یەک شەو دوای دوا یەکتر بینینی لەگەڵ دەنکەهەنار، ئامۆزاکانی دەنکەهەناریان لەخەودا کوشتووە. ئەو ڕۆژە دەنکەهەنار دیار نابێت، لاس بە بێئارامییەوە بە درێژایی ئەو ڕۆژە چاوەڕێی دەکات. دووای ئەوەی لە هاتنی دەنکەهەنار بێئومێد دەبێت، دەچێت لە دوکاندارێکی نزیک ماڵی دەنکەهەنار پرسیار دەکات و کابرای دوکاندار چیرۆکێکی ترسناکی بۆ دەگێڕێتەوە.

*** *** ***

سەر لە ئێوارە دەنکەهەنار وەک هەر ئێوارەیەکی تر لەگەڵ باوەپیارەکە و دایکیدا لە حەوشە نانی ئێوارە دەخۆن. دوواتر دەنکەهەنار خۆی سەرقاڵ دەکات بە خوێندنەوەی نامەیەکی لاس کە شیعرێکیشی لەگەڵدایە. ئینجا دەنکەهەنار دەست دەکات بە خوێندنەوەی یاداشتەکانی ڕەفیق حیلمی تا شەوێکی درەنگ. دایکی دەنکەهەنار و باوە پیارەکەی بە قادرمەکاندا سەردەکەونە سەربان بۆ خەوتن. دەنکەهەناریش دەوروبەری سەعات دوانزەی شەو هەست دەکات خەوی دێت. بۆیە ئەویش دەچێتە سەربان بۆ خەوتن. دایکی جێگاکەی لە لای ڕاستی خۆرهەڵاتی سەربانەکەوە بۆ

داخستووە. کاتێک دەنکەهەنار دەگاتە سەر جێگاکەی هەر زوو خەو دەیباتەوە و وەک منداڵێکی ساوا دەچێتە خەوێکی قووڵەوە. کەمێک دوواتر، دوو تارمایی - هەر بۆ ڕۆژی دوواتر هەموو خەڵک دەزانێت ئەو دوو تارماییە ئامۆزاکانی دەنکەهەنار خۆی بوون- لە ناو تاریکیەوە و لە سیلەی کۆڵانەکەی ماڵی دەنکەهەنارەوە دەردەکەون. ئینجا بە ماتەمات بەسەر حەوشە نزمەکەی ماڵی دەنکەهەناردا سەردەکەون و ڕێک دێنە ناو حەوشەکەیانەوە. ئینجا وەک ئەوەی خاوەنماڵ بن بەسەر قادرمەکاندا هەڵدەگەڕێن تا دەگەنە سەربانەکە و دەبینن دەنکەهەنار بە ماکسیەکی شینی کاڵەوە کە ئەو ڕۆژانە کچان زۆر دەیانکردە بەریان، خەوتووە. دەبینن دەنکەهەنار پەتۆیەکی قاوەیی داوە بەسەر بەشی خوارەوەی لەشیدا و دەستێکی کەوتۆتە سەر کۆنکریتی سەربانەکە و دەستەکەی تریشی لەسەر سکی داناوە. ئەوەش دەبینن لەو سەری بانەکەش پیرەمێرد و پیرێژن وەک دوو پشیلەی نەخۆش لە ژێر چەرچەفێکی زۆر کۆندا پرخە پرخیان دێت. ئەو دوو تارماییە شەرم لەو سیما سادەیەی دەنکەهەنار ناکەن کاتێک لە ژێر تریفەی ئەو مانگەشەوەی مانگی خەرماناندا خەوتووە. ئەوان هەر زۆر پێش ئەوەی بگەنە ماڵی دەنکەهەنار تفەنگەکانیان سوار کردووە، سەیرێکی یەکتر دەکەن و لە یەک کاتداو بە خوێنساردیەکی بێئامانەوە سەرو یەک دەسترێژ گوللە

بە دەنکەهەنارەوە دەنێن. ئینجا بە خێرایی بە قادرمەکاندا دادەکشێن بۆ ناو حەوشەکە و خۆیان بە سەر دیواری حەوشەکەدا ئاودیوی دەرەوە دەکەن و لە کۆڵانە تاریکەکەوە وون دەبن.

پیرەمێرد و پیرێژن بە دەنگی تەقەکان بە خەبەر دێن و گوێیان لە دەنگی پێی تارماییەکانیش دەبێت کە بە حەوشەکەیاندا بۆی دەردەچن. یەکەمجار ئەوان نازانن ئەو فیشەکانە دەنکەهەناریان پێکاوە بەڵکو وای بۆ دەچن لەماڵەکانی دراوسێیانەوە دەنگەکان هاتبن، بەڵام پاش ئەوەی ساتێکی کەمی پێدەچێت و نابینن دەنکەهەنار وەک ئەوان بە خەبەر بێت، هەردووکیان پێکڕا لە جێگاکانیاندا ڕاستدەبنەوە و ڕێوڕاست دەگەنە لای جێگاکەی دەنکەهەنار. چەند ژن و پیاوێکی ماڵەکانی دراوسێش هەر لە هەمان کاتدا لە سەربانەکانی ترەوە دەگەنە سەربانەکەی ماڵی دەنکەهەنار. لەو کاتەیدا ژن و پیاوەکان دەپرسن " ئەرێ ئەوە چی بوو؟ دەنگی ئەو تەقانە لێرەوە هات؟" ئەوە هەمان ئەو کاتە دەبێت پیرەمێرد و پیرێژن چاویان دەکەوێتە سەر دەنکەهەنار کە ماکسیە شینە کاڵەکەی سەرتاپای خەڵتانی خوێنە و لەلای کەلەکەی چەپیەوە چەند پێچێک لە ڕیخۆڵەی کەوتۆتە سەر دۆشەکەکەی. تەرمۆزەیەکی پڕ لە سەهۆڵ لە نزیک جێگاکەی دەنکەهەنارەوە دانرابوو، چەند فیشەکێکی بەر کەوتبو و بە زەبری فیشەکەکان هەڵدڕابوو. ئەو کاتەی دایک و

باوەپیارەکەی دەگەنە سەر تەرمی دەنکەهەنار هێشتا خوێنی گەرم لە برینەکانی لەشی دێت و دەڕژێت بە سەر دەیان پارچە سەهۆڵی ڕژاودا. لەو شەوەدا سەرجەم دانیشتووانی گەڕەک بە دەنگی تەقەکان بە خەبەر دێن، بەڵام ئەوەی هەرگیز بە خەبەر نایات دەنکەهەنار خۆیەتی.

*** *** ***

# خانی بیر لە نیشتیمانەکەی خۆی دەکاتەوە

ئێمە هەمووومان دەمانزانی خانی لە خاکێکی دوورەوە هاتووە. زۆر جار لە خۆیمان بیستبوو ناڕەحەتی زۆری بینیوە لە ڕێگای هاتنی بۆ ئێرە. ئەو چەندان جار باسی ئەو کاتانەی بۆ کردبووین کە یەکێک بووە لەو چەکدارانەی دژی نەوەکانی هیرۆدۆس شەڕی کردووە و نەهامەتی زۆری چەشتووە، هەر لەو برسێتیانەوەی بڕست لە ئینسان دەبڕن تا تینوێتی دڵپڕووکێن، لە هەڵپڕووکان لە ناو گەرمادا و ڕۆیشتنی دووروو درێژ بە ناو بەفر و چیا و هەڵدێری سەختدا، بەڵام ئێمە وەکو ئەو نەماندەزانی میللەتێک لە مەترسیدایە، تەنانەت ئەو ڕۆژەش کە لە شاشەی تەلەفیزیونەکانەوە شتێکی سەیرمان بینی و هەر لە ڕۆژی زیندووبوونەوەی مردووان دەچوو، خانی پێی دەگوت ڕاپەڕین.

ئەو کات من و میلیاس تەمەنمان هەشت ساڵان بوو. لە پڕ ماڵەکانمان پڕ بوو لە باسی جەنگ. شەو و ڕۆژ باس هەر باسی لەشکرکێشی و کۆکردنەوەی سەدان تابووری گەورەی سەرباز و ناردنیان بوو بۆ ناو ئاوەکانی کەنداو. دیپلۆماتەکان بە سەدان لە نێوان وڵاتاندا دەهاتن و دەچوون و تەونێکی جاڵجاڵۆکەیی

نەبینراویان لە هەوادا دەچنی. بەردەم وەزارەتی جەنگ و بنکە سەربازیەکان پڕ دەبوو لە سەدان پیاو، لەو پیاوانەی شان و سەر سنگ و بەرۆکیان بە ئەستێرە و داڵ و نیشانەی جۆراوجۆری سەربازی داپۆشرابوو. حکومەتەکانی دنیا کەشتیی پڕ لە سەرباز و چەک و جبەخانەیان دەنارد بۆ ناوچەیەک کە هێشتا لە ناو خۆڵەمێشی جەنگێکی تردا دەگەوزا. ئیتر ئێمە هەموومان تێگەیشتین جەنگێکی گەورە دەقەومێت. گوێمان لێبوو باوکم ڕووی دەکردە خانی و دەیگوت "بۆ پێت خۆشە شەڕ هەڵگیرسێت؟ ئاخر خانی هەزاران سەرباز دەکوژرێن، شارەکان و گوندەکان وێران دەبن، دەریاکان پڕ دەبن لە لاشەی کوژراوی لاوانی بێمراد، پڕ دەبن لە پارچەی شکاوی فڕۆکە و سەیارە و کەشتیەکان و عارەق و خوێنی سەربازەکان و گازو بەنزینی ڕژاوی ترومبێلە گەورە و زەبەللاحەکان."

خانی وەک ئەوەی دڵنیا نەبێت ئاراستەی ڕوداوەکان بەرەو کوێ دەڕوات، بە دەنگێکی خەمناکەوە دەیگوت "هیربەرتی ئازیزا لەوێندەر هیچ نەماوە وێران نەبووبێت. لەوێ هەموو شوێنێک وێرانەیە – هەموو کەسێک پێش ئەوەی لە دایک بێت مردووە. ئەوێ گۆڕستانێکی گەورەیە، لێگەڕێ بەشکو لە ناو دوکەڵ و تەمتومانی ئەو جەنگەدا دەرفەتێک بۆ مردووەکان هەڵکەوێت زیندوو ببنەوە."

سەرۆکی وڵاتان لە شاشەی تەلەفزیونەکانەوە بە گرژی دەردەکەوتن و تورە و نیگەران دیار بوون. بەڵام ئێمە لە ناو ئەو هەموو هەراو زەناو باسی جەنگ و کاولکاریەدا، لە ناو چاوەکانی خانی‌دا، لە جوڵەی نەرمی لێوەکانی و لە ناو تۆنی دەنگیدا هەستمان بە خۆشنوودی و مژدەیەک دەکرد، مژدەیەک من و میلیاس نەماندەتوانی تێیبگەین.

لە گەڵ گەرمی و توندوتیژی دەنگوباس و ڕاگەیاندنە سەربازیەکان و فڕکان فڕکانی شەڕ، هەواڵەکان باسی سەرگەردانبوونی هەزاران سەربازیان دەکرد لە بەرەکانی جەنگدا. باسی هەزاران سەربازمان بیست کە بیابان قووتیدابوون و هەزارانی تر دەریا هەڵیلووشیبوون. ڕۆژنامەکان بابەتیان لە سەر ئەو دەیان کەشتیانە ئامادە دەکرد کە بە هەزاران سەربازەوە دەریا قووتیدابوون. پەیامنێری ڕادیۆکان ڕاپۆرتیان لە سەر ئەو سەدان ماشێنە سەربازیانە دەدا کە بە سەرنشینەکانیانەوە سووتابوون. باسی وێڵبوونی هەزاران سەرباز و دەیان مێگەلی حوشترمان بیست لە ناو کێڵگە فراوانەکانی میندا. لە تەلەفزیۆنەوە وێنەی ئەو فڕۆکە پێکراوانەمان بینی کە وەکو نەیزەکێکی ئاگراوی دەکشان و دەکەوتنە ناو لمی بیابانەوە بۆ هەتاهەتایە خامۆش دەبوون. ڕاگەیاندنی دەوڵەتان باسی سەرکەوتن و دۆڕانیان دەکرد. من و میلیاس بەو منداڵیەی خۆمانەوە دەمانزانی

خانی خۆشنوودە و هەندێک جار شەرمی دەکرد دڵخۆشی خۆی بەرامبەر ئەو وێرانکاریە بە ئاشکرا دەرببڕێت، بە تایبەت لەو کاتانەی من و میلیاسی کوڕی ئامادە باینایە. بەڵام لە نیگای چاوانیدا و لە شێوازی قسە و گوفتاریدا خۆشنوودیەک هەبوو نەدەشاردرایەوە.

ئێوارەیەک ئاراستەی ڕووداوەکان بە شیوەیەکی سەیرو دراماتیکی گۆڕا. لە پڕ دەنگوباس ڕایگەیاند جەنگ وەستا. باوکی میلیاس لەو ماوەیەی پێشوودا زۆر هەوڵیدابوو دڵشادی خۆی بە ڕوودانی جەنگەکە بشارێتەوە بەڵام هەرچەندی کۆشا نەیتوانی خەمباری خۆی بەرامبەر وەستانی جەنگەکە بەو کتوپڕیە و بە بێ هاتنەدی ئەو ئەنجامانەی لێی چاوەروان دەکرد، بشارێتەوە. ئەو ئێوارەیە هەموومان لە ماڵی میلیاس دانیشتبووین و نانمان دەخوارد کاتێک لە ڕادیۆوە هەواڵی وەستانی جەنگمان بیست. ئاگامان لێبوو باوکی میلیاس بەبێ ویستی خۆی دەستی لە خواردنەکە هەڵگرت و ڕەنگی لە ئەسمەرێکی سادەوە بۆ ڕەشێکی قەترانی داگەڕا.

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

"موعجیزەیە، موعجیزەیەکی تەواوە میللەتێک هەستاوەتە سەرپێ. سەدان هەزار لاشە لە گۆڕەکانیانەوە ڕاستبوونەتەوە و هاوار بۆ ئازادی دەکەن" خانی بە جێبەخۆنەگرتووییەوە لە ماڵەکەدا دەهات و دەچو و وایدەگوت. دەستەکانی لێکدەخشاندن و بە گەرموگوڕیەوە قسەی دەکرد. ئەو دەیگوت موعجیزەیەکە و بڕوانەکردەیە، ئەو دەیگوت ملیۆنان کەس دژی زۆرداری لە وڵاتەکەی ویدا ڕاپەڕیون.

من و میلیاس باش تێنەدەگەیشتین، بەڵام لە تەلەفزیۆنەکانەوە هەزاران کەسمان بینی پەلاماری بنکە و بارەگا حکومیەکانیان دەدا. هەزاران کەس بە هەزاران ئاڵای ڕەنگاوڕەنگەوە لە بەردەم زرێپۆشەکاندا دەچەقین. زیلی کۆنی سەربازیی پڕ بوو لە منداڵانی لەشقوڕاوی. هەزاران سەربازی بێچارە تفەنگەکانیان فڕێدەدا و لە مارشێکی خەمگیندا تەسلیم دەبوون. هەزاران پیاو جامانەکانیان داگرتبو و لە دواوەی تیۆتاکاندا ڕایاندەوەشاند. ئەوەی دەمانبینی دڵخۆش بوو، ئەوەی دەمانبینی مەیلی لە هێرش و پەلامار بوو. گەنجانێکی خوێنگەرممان بینی هەڵمەتیان دەبردە سەر زیندانەکان و دەرگاکانیان دەشکاند و بەندیەوانەکانیان دەخستە سەر نووکی نێزەی تفەنگەکانیان. ئینجا هەزاران زیندانی بە قژ و ڕیشی درێژ و چڵکنەوە هوروژمیان بۆ دەرەوە دەهێنا و بە واقوڕماویەوە تێکەڵی ئەو مەحشەرە دەبوون. خەڵکانێکیش لەوانەی بەخت یاوەریان

نەببوو تا پەلاماری بنکەی سەربازی و هەواڵگریەکانی حکومەت بدەن، پەلاماری بەڕێوەبەرایەتیەکانی کشتوکاڵ و ئاوو ئاوەڕۆ و خەستەخانەکانیان دەدا. ژنانی دووگیانمان بینی موبەریدەیان بە دوای خۆیاندا ڕادەکێشا. پیاوانێکی شەلمان بینی سەلاجەیان کردبۆ کۆڵیان. منداڵانی پێپەتیمان بینی ڕەفەی گەورەی کتێبخانەکانیان ئاگر تێبەردەدا.

هەموو کەسێک پەلاماری دەدا، هەموو کەسێک توندوتیژی دەنواند. لە تووڕەیی ملیۆنان کەسەوە گڕکانێکی گەورە لە ناو سوتماکی هەزاران گوند و شار و گۆڕستانەوە تاوی دەسەند. لە ناو ئێسک و پروسکی ملیۆنان کەسەوە ملیۆنان تارمایی هەڵدەستانەوە و لە کەرنەڤاڵێکی گەورەدا پەلاماری هەر شتێکیان دەدا کە دەهاتە ڕێگایان. هەموو شتێکیان ئاگر تێبەردەدا و دەیانڕوخاند و هاواریان دەکرد" بژی، بژی" و وێرانیاندەکرد و دەیانگوت "ئاوەدان بێت، ئاوەدان بێت، بە کوێرایی چاوی دوژمنان". هەزاران کەسمان بینی بە سەر لاشەی سەدان کوژراودا بازیان دەدا و ئاوڕیان نەدەدایەوە.

من و میلیاس ئەوسا منداڵ بووین بە چاکی لە شتەکان تێنەدەگەیشتین بەڵام ئەوەی لە تەلەفزیۆن بینیمان، ئەوەی لە ڕادیۆ بیستمان دەربارەی ئەو ڕوداوانە یەکجار ترسناک بوو. بۆیە نە

ئەوسا و نە ئێستاش تێیان نەگەیشتین سەرەڕای ئەوەی هەوڵێکی زۆریشماندا تێیان بگەین.

*** *** ***

خۆشنوودیەکانی خانی زۆری نەخایاند. لەپڕ هەموو خەندە و دڵخۆشیەکانی بە نائومێدی و بێدەنگیەکی سامهێنەر گۆڕا. جووڵە و ڕەفتاری هێمنتر و خەمهێنتر بۆوە. ئەمجارەیان لە باتی ئەوەی بڵێت موعجیزەیە دەیگوت " دیسانەوە ئێمەیان فرۆشت، دیسانەوە دنیا پشتی تێکردین".

ئەمجارەیان وێنەی سەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان گۆڕا. ئەوانەی دوێنێ بینیمانن پەلاماریاندەدا و هێرشیاندەکرد، ئەمجارە بینیمانن بە ملیۆنان پشتیان کردبۆ ماڵ و هەموو ئەو شتانەیان کە هەیانبو و باوەشیان کردبو بە دەشت و چیاو دۆڵە سەختەکاندا. ملیۆنان ماڵبەکۆڵ لە هەورازو نشێوەکان ئاوا دەبوون، بە چیا سەختەکاندا هەڵدەگەڕان ولە ژێر باران و تەرزەدا ڕۆژیاندەکردەوە. سەدان پیرەمێرد وپیرێژن لە ناو بەفرا ڕەقهەڵدەهاتن و جێدەهێڵران. سەدان منداڵ لافاو دەیبردن و کەس پێڕانەدەگەیشت بیانگرێتەوە. خێڵێکی

هیلاک و پەشێو لە بەر ئاگرۆچکەکان کۆزیلکەیان بەستبو و هەڵدەلەرزین، لە ناو کێڵگەی مینەکاندا پارچەپارچە دەبوون و نەوەیەکی تەواو بێدەست و قاچ وەک ملیۆنان پەنگوینی نەخۆش بە سەرزەویدا دەڕۆیشتن. هەزاران لەوانەی تا دوێنێ شانازیان بەوەوە دەکرد کە خەبات بۆ ئازادی دەکەن، ببوون بە کۆمەڵێک هەژارو لێقەوماو و بە دووای ئەو بارە بەتانی و خواردنانەدا ڕایاندەکرد کە کۆپتەرەکان بۆیان فڕێدەدان. من و میلیاس دەمانگوت ئەوانە بۆ ڕادەکەن؟ بۆ کوێ هەڵدێن؟ خانی دەیگوت ئەوانە لە ترسی نەوەکانی هیرۆدۆس ڕادەکەن.

سالآنێک دوواتر من و میلیاس گەورەبووین و زیاترمان لە سەر نەوەکانی هیرۆدۆس زانی. ئەوەش هەم خانی و هەم لاس بۆیان باسکردین و هەم بە هۆی سەفەرەکانی میلیاس و ئەو نووسراوەش کە خانی بۆی جێهێشتین دیوەکانی ئەو چیرۆکەمان وردە وردە زیاتر بۆ دەرکەوت، ئەو چیرۆکەی باسی نەوەکانی هیرۆدۆسی دەکرد.

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

# لاس و خوسرەوی یەکتر دەبینن

کاتێک ئەو کابرا تورکمانە کوتاڵفرۆشەی دوکانەکەی لە سەر سووچی ئەو کۆڵانە بوو کە ماڵی دەنکە هەناری لێبوو، ئەو قسانە بۆ لاس دەگێڕێتەوە، لاس بێحەق و حیساب شارو قەڵا جێدێڵێت و ڕوو دەکاتە خاکی ڕەی. لە ڕەی ماوەیەکی زۆر بە دڵشکاوی لەگەڵ کۆمەڵێک ئاوارەی تردا خەریکی دروستکردنی خشتی سوور دەبێت و هەر بیری دەچێتەوە کە ئەو یەکێکە لە شاعیرە هەرە باشەکانی وڵاتی خۆی. کاتێکیش ئیشەکەیان لە ڕەی دەیداتە کزی، لەگەڵ کۆمەڵێک گەنجی تر ڕوو دەکەنە مەشهەد بۆ سێوڕنین. کاتێک لاس بە تەلەفۆن بە خانی گوتبوو دەیەوێت بچێت بۆ مەشهەد، خانی زۆر بە ڕوونی نیگەرانی خۆی نیشاندابوو. ئەو نیگەرانی نیشاندانەی خانی بەلای لاسەوە سەیر ببوو بۆیە داوای ڕوونکردنەوەی زیاتری لە خانی کردبوو، بەڵام خانی ناتوانێت بۆی ڕوونبکاتەوە ئیتر ناچار واز لەو بابەتە دەهێنێت.

ئەو کاتەی لاس لە کێڵگەکانی دەوروبەری مەشهەد خەریکی سێوچنین دەبێت، بە تەواوی هەوڵدەدات خۆی و ڕابردووی لە یاد بکات. ئەو کاتانەی کار دەکات، کار دەکات، ئەو کاتانەی کاریش

ناکات هەمیشە هەر لە ژوورەوە و لە دۆخێکی گۆشەگیرانەدا  بە دوورەپەرێزی ژیان بە سەر دەبات. ئەو ماوەیە هەموو هەوڵی لاس ئەوە دەبێت پارەیەک پاشەکەوت بکات و لە گەڵ ئەو برادەرە ئاوارانەی خۆیدا ڕوو بکاتە وڵاتێکی دوور. هەر لەوێشەوە چەند جارێک لە گەڵ خانی پەیوەندیان بە یەکەوە کردبوو.

ڕۆژێک برادەرەکانی لاس هەرچۆنێک دەبێت لاس دەهێننە سەر ئەو باوەڕەی لەگەڵیاندا بچێتە ناو شاری مەشهەد بۆ لای ئەستێرەناسێکی بەناوبانگ بۆ ئەوەی چارەنووسیان بخوێنێتەوە.

ڕۆژێک لاس و سێ هاوڕێی تری ڕوو دەکەنە ناو شاری مەشهەد و بەرەو ماڵی کابرای ئەستێرەناس بەڕێدەکەون. دوای ئەوەی ئەستێرەناس سەرقاڵی قسەکردن دەبێت لەگەڵ هاوڕێکانی لاسدا، لە پڕ چاوی دەکەوێتە سەر لاس و نیگایان لە یەکتر گیر دەبێت. پیاوە پیرەکە چەند جارێکی تر بە کەمێک دوودڵیەوە و بە شێوەیەکی تا ڕادەیەک نائاسایی سەیری لاس دەکات.

لاس لە دڵەوە بڕوای بە خوێندنەوەی چارەنووس نەبوو، بەڵام ئەو ڕۆژە نەیویستبوو بێدڵی هاوڕێکانی بکات. کاتێکیش پیاوە پیرەکە بە نیگایەکی جێگیر سەرنجی لاسی دابوو، لاس پەشۆکابوو.

"وا هەست دەکەم من لە جێگایەکی تر تۆم بینیبێت" کابرای ئەستێرەناس بە دەنگێکی کزی پیرانەوە ئەوەی گوتبوو.

لاس شتێکی وا ناڵێت، تەنیا بە زەردەخەنەیەکی خاڵیی لەماناوە سەیری پیاوە پیرەکە دەکات. بەڵام ئەوەی لاس تووشی دڵەڕاوکێ دەکات ئەو ساتە دەبێت کە کابرا سەیری ناولەپی دەکات. کابرای ئەستێرەناس بە ڕیشێکی درێژی سپییەوە، سەری بەسەر دەستی لاسدا شۆڕدەکاتەوە، تا ئەو ڕادەیەی ڕیشی لە ناولەپی لاس دەخشێت و تاماوەیەکی درێژ سەر هەڵنابڕێت.

"من پێویستە ڕۆژێکی تر تۆ بە تەنیا ببینم و قسەت لەگەڵدا بکەم" پیرەپیاو بە جددیەتێکی زۆرەوە و بە دەنگێکی لەرزۆکەوە ئەوەی گوتبوو، بەڵام لاس بەڵێنی یەکتربینینەوەی بە کابرا نەدابو و پێی گوتبوو کە ئەو زۆر سەری قاڵە. لاس هەرچەندە لای برادەرەکانی کەمێک بە لاقرتێوە باسی کردبوو، بەڵام لە دڵەوە هەرگیز نەیتوانیبوو ڕەنگپەڕینی کابرای ئەستێرەناس و دەنگە لەرزۆک و جددیبوونەکەی و پێداگریەکەی لە سەر پێشتر بینینی لاس و هەروەها داواکەی بۆ یەکتر بینینەوە فەرامۆش بکات، بۆیە شەش ڕۆژ دوای یەکەم بینینی کابرای ئەستێرەناس، لاس عەسرێکی درەنگ گەڕایەوە بۆ لای ئەو.

"دەمزانی دێیتەوە" ئەستێرەناسەکە وای بە لاس گوتبوو.

"چیت لە من دەوێت؟ پێم نالێیت پێشتر منت لە کوێ بینیوە؟" لاس بە زبریەوە ئەوەی گوتبوو. بەڵام پیرەمێردە مەشهەدیەکە ئەو جۆرە قسەکردنەی لاسی لە دڵ نەگرتبو و وەک کەللەشەقیەکی تایبەت بە کوڕانی لاو وەریگرتبوو.

"من تۆم لە خەونی پیاوانێکدا بینیوە کە زیاتر لە بیست ساڵ پێش ئێستا لە مەشهەدەوە بەرەو شار و قەڵایەک بەڕێکەوتن بۆ ئەوەی تۆ ڕزگار بکەن و تۆش دەستنووسێک ڕزگار بکەیت". ئەو کاتەی پیاوەکە ئەو قسەیە دەکات، کتوپڕ لاس سەرجەمی چیرۆکی خۆی و خەونی پیاوانی مەشهەدی دێتەوە یاد.

"بەڵام بۆ من؟ بۆ تەنیا من؟ لە کاتێکدا ئەو قەڵایە هەزاران کەسی تری تێدا بوو؟ بۆ هەر دەبوایە من ڕزگار بم؟ ئایا کەسی تر نەبوو دەستنووسێک کە هەر نازانم چیە ڕزگار بکات؟ پێم نالێیت بۆ ئەو پیاوانە خۆیان بە سەربڕین دا؟ چی ئەو پیاوە مەشهەدیانەی گەیاندە وولاتی ئێمە و باوکیشمیان لە ماڵ تەراند؟" لاس بە دەنگێکی کەمێک بەرز و تێکەڵ بە ناڕەزاییەوە ئەوەی گوت.

"لە ڕاستیدا بۆچی تۆ، بۆ کەسێکی ترنا، ڕەنگە منیش بە تەواوی نەزانم، بەڵام بیرت نەچێت تۆش نەبوایەیت دەبوایە کەسێکی تر ئەو دەستنووسە ڕزگار بکات. کوڕم خوا بە شێوەیەک جووڵەی ئەستێرەکانی لەگەڵ ژیان و چارەنووسی ئێمە ڕێکخستووە کە ئێمە هەرگیز ناتوانین بە پێچەوانەی ئەو چارەنووسەوە ڕەفتار بکەین. ئەگەر وانەبێت هارمۆنیای دنیا تێکدەچێت"

"هێشتا هارمۆنیای دنیا تێک نەچووە؟ بۆ پێت وایە دنیا زۆر لە شوێنی خۆیەتی؟ جا چیماوە لە شوێنی خۆی لانەچێت؟" لاس بە بێئارامیەوە ئەو قسانەی کردبوو.

" بیرت نەچێت لاوۆ، دنیا لە هارمۆنیەتێکی ئەندازەیی تەواودایە، ئەگەر ئەو پیاوە مەشهەدیانە بە خەونەکانی خۆیان تۆیان رزگار نەکردبا تۆ ئێستا لێرە نەدەبوویت، بەڵام تۆ دەبوایە لێرە بیت، پیاوانی مەشهەدی دەبوایە بە خوێنی خۆیان ڕزگاری تۆ بکرن، تۆش دەبێت بە خوێنی ......، ئا بەڵی تۆش دەبێت دەستنووسێک ڕزگار بکەیت" خوسرەوی بە زەردەخەنەوە وای بە لاس گوتبوو.

"دەی بیلێ ، بۆ ناڵێیت منیش دەبێت بە خوێنی خۆم دەستنووسێک ڕزگار بکەم؟ بەڵام تۆ دەزانیت پیاوانی مەشهەد سەربڕدران؟ باوکم

کەس نازانێت چی لێهات؟ و سەرجەم نێرەوەزەکانی قەڵاکەش زیندەبەچاڵ کران" لاس وای گوتبوو و قورگی پڕ ببوو لە گریان.

"وایە. ئەوان ئەو کاتەی لێرە ڕۆیشتن من زانیم ناگەڕێنەوە. ئەوەی ڕوویدا مایەی خەمی منە، بەڵام لاس، پێم خۆشە تۆ ئەوە بزانیت ئەوەی ڕویدا هەرگیز دژی هارمۆنیای دنیا و جوڵەی ئەستێرەکان نەبوو"

لاس زۆر توڕە ببوو کاتێک ئەو قسانەی گوێ لێببوو، بۆیە هاواری کردبوو " ئەی دادپەروەری؟ پیری ئاخرشەڕ، ئەی دادپەروەری چی لێبکەین؟ تۆ بۆ هێندە بە خەمساردی باسی مەرگی کەسانی تر دەکەیت؟"

خوسرەوی سەری داخستبو و یاری بە دار جگەرەکەی دەستی کردبوو.

"دادپەروەری مەسەلەیەکی ترە و ئەوە زیاتر لاوەکان حەزیان لە باسکردنیەتی، بەڵام تۆ هیچ ئاگات لەوە هەیە ئەوانەی پیاوە مەشهەدیەکانیشیان سەربڕی هەر باسی دادپەروەریان دەکرد؟"

"کەواتە پیاوە مەشهەدیەکان و قەسابەکانیشیان وەک یەک مافیان هەیە باسی دادپەروەری بکەن؟"

"نا، لاس، نا، من وا نالێم. من پێم وایە هەمیشە کەسانێک هەن جەور و بێدادی دەنوێنن و کەسانێکیش بێدادیان بەرامبەر دەکرێت. هەموومان بەشێوەیەک لە شێوەکان بەشداری لەو یاریەدا دەکەین، بەڵام ئەوە جوولەی ئەستێرەکان و ئیرادەیەکی باڵایە دیاریدەکات ئێمە لە کام لای هاوکێشەکەدا بین"

ئینجا خوسرەوی ڕووی کردە لاس و لێی پرسی " تۆ هیچ دەربارەی خەونی پیاوانی مەشهەد دەزانیت؟"

"من تەنیا ئەوەندە دەزانم ئەوکاتەی من ساوا دەبم سێ پیاوی ئێرانی دێن بۆ ماڵمان و باوکم و دایکم ئاگادار دەکەن من ببەن بۆ دەرەوەی شار و قەڵاکەی خۆمان بۆ ئەوەی نەوەکانی هیرۆدۆس سەرم نەبڕن، بەڵام من تێناگەم بۆ من؟ لە کاتێکدا هەزاران لە دانیشتوانی قەڵاکە زیندەبەچاڵکران"

"ئەدی هیچ دەربارەی دەستنووسەکە دەزانیت؟" خوسرەوی پرسی بووی.

لاس کەمێک بیری کردبۆوە بەڵام هیچ شتێکی دەربارەی ئەو دەستنووسە نەدەزانی کە خوسرەوی باسی دەکرد، ئەوەندە نەبێت کاتێک پیاوانی مەشهەد ساڵانێکی زۆر پێشتر هاتبوونە ماڵی لاس

باسی دەستنووسێکیان کردبوو کە لاس لە زەمان و شوێنێکی تردا ڕزگاری دەکات.

"گویَ بگرە لاس، پیوانی مەشهەد هاتنە لای من و خەونەکانی خۆیانیان بۆ گێڕامەوە. لە خەونەکانیاندا مەریەمی مەجدەلیان بینیبوو. لە خەونەکەیاندا مەجدەلی پێی گوتبوون بڕۆن بۆ ناو قەڵایەک لە ناو شارێکی گەورەی نزیک نەینەوا و بە باوکت بڵێن کە تۆ لە قەڵاکە بەرێتە دەرەوە، چونکە تۆ لە داهاتوودا دەستنووسێکی گرنگ لە سووتان ڕزگار دەکەیت. گویَ بگرە لاس، ئەو چیرۆکە هێشتا کۆتایی نەهاتووە، تۆ ئەرکێکی گرنگت لە سەر شانە. ئەرکێکە کەسی تر ناتوانێت جێبەجێی بکات، ئەویش ڕزگارکردنی دەستنووسێکی گرنگە لە سووتان و فەوتان"

لاس ئێوارەیەکی درەنگ لای خوسرەوی ڕۆیشتبو و بە تێکشکاوی گەڕابۆوە لای برادەرەکانی. ئەو شەوە تا درەنگ هەر بیری کردبۆوە و جار جارە لە بەر خۆیەوە گوتبووی " دەستنووسی چی، من ڕۆحی خۆم بۆ دەرباز ناکرێت"

*** *** ***

# قەشە لاوەکە نووسراوێک دەدات بە میلیاس

ماوەیەکی کەم دوای کوژرانی باوکم نەخۆشیە کۆنەکەی خانی بە توندی سەری هەڵدایەوە و ڕۆژ بە ڕۆژ لە پەرەسەندندا بوو. ئەو بەهۆی ئەو ساڵە سەختانەی لە شاخ ژیابو و ئەو چەرمەسەریانەی لە ڕێگای هاتنی بۆ ئێرە بەرەو ڕووی ببۆوە، گورچیلەکانی و جگەری بە سەختی دووچاری هەوکردن ببوون و بە تەواوی بەرەو داڕزان دەچوون. خانی جگە لە نەساغیەکەی خۆی و ئەو زامەی گەڕانەوەی لاس بۆ وولاتی خۆی تیایدا بە جێی هێشت، کوژرانی بابیشم بەو شێوە تراژیدیە هێندەی تر مات و غەمناکتری کرد. دەبووایە هەر بە دوو هەفتە جارێک دکتۆرەکەی ببینێت. لەو مانگانەی دواییشدا خەوی زۆر کەم ببۆوە و ئەو شەوانەی من لە لای میلیاس دەخەوتم تا بەیانی گوێمان لە کۆکە کۆک و دەنگی پێی ئەو بوو کە لە تاو ئەو ئازارانەی هەیبوو حەجمینی لێهەڵگیرابوو. کەم شەو هەبوو لە نیوەی شەودا ڕاست نەبێتەوە و لە ژووری نوستنەکەیەوە نەچێت بۆ ئاودەست و لە وێشەوە دانەگەڕێت بۆ موبەقەکە. شەوێک لەو شەوانە، کاتێک من و میلیاس لە ناو جێگادا بووین گوێمان لە دەنگی کۆکەو خشەخشی نەعلەکانی بوو کە بە

دووای خۆیدا ڕایدەکێشان و جموجوڵە نائاساییەکەی بە تەواوی نیگەرانی کردین. من ڕۆیشتمە دەر لە ژوورەکە و ملی قادرمەکانم گرت بەرەو موبەقەکە. موبەقەکەی ماڵی میلیاس لە ژوورێکی گەورە پێکهاتبوو و جگە لە پێداویستیەکانی موبەقێکی ئینگلیزی کورسیەکی قاوەییشی لێبوو کە کەمێک بەرەو دوواوە لار ببۆوە و ئینسان دەیتوانی لە سەری پاڵبکەوێت، بەهەمان شێوەی ئەو کورسیانەی گەشتکەرەکان لە ناو لمی کەنار دەریاکان و لە ژێر خۆرەتاودا دایدەنێن و لەسەری پاڵدەکەون. من بە بیانووی ئاو خواردنەوە چوومە ناو موبەقەکە و بینیم باوکی میلیاس وێنەیەکی لاسی بە دەستەوەیە و دەگری. کاتێک خانی هەستی بە بوونی کەسێک کرد لە نزیکیەوە هەوڵیدا وێنەکەی لە دەستیا بشارێتەوە و وا خۆی نیشاندات کە ناگری.

'زۆر نەخۆشم ئۆفیلیا، ئەو دەرمانانەی دەیانخۆم تەنیا یەک دوو سەعات سوودیان هەیە' خانی لە گەڵ کردنی ئەو قسانەدا شێوازی دانیشتنی خۆی گۆڕی. منیش هەر بۆ ئەوەی بەشداری قسەکردنەکانی بکەم بە نیشانەی ئەرێ سەرم ڕاوەشاند، ئینجا بە جووڵەی لەش و دەست ئاماژەم کرد کە مووبەقەکە ساردە. دواتر من گەڕامەوە ژوورەکە لای میلیاس و بە هیچ شێوەیەک نەهاتمە

سەر ئەو مەسەلەیەی کە خانیم بینیوە بەسەر وێنەیەکی لاسدا گریاوە.

خانی وایلێهات ئیتر زۆر بە خراپی دەیتوانی بجوڵێت. لە تاو ئازار بە ماڵەکەدا دەهات و دەچوو کەمێک پشتی کۆم دەکردەوە و دەستی ڕاستی دەگرت بە سکیەوە. ڕۆژ بە ڕۆژ ڕەنگی زیاتر دەپەڕی، چاوەکانی زیاتر بە قووڵدا دەچوون و بەرەچاوی زیاتر و بە شێوەیەکی غەریب شین هەڵدەگەڕا، تا کار بەوە گەیشت بە پێی ڕێنمایی دکتۆر لە نەخۆشخانەیەکی بچووک خرایە ژێر چاودێری پزیشکیی وردو بەردەوامەوە. من و میلیاس و دایکم و پورە ڕێبیکام بە لایەنی کەمەوە ڕۆژی جارێک سەردانمان دەکرد و جاری واش هەبوو تا ئێوارە یان هەندێک جار تا شەوێکی درەنگ لە لای دەماینەوە. ئەو ماوەیە من و میلیاس زۆربەی شەوەکان بەیەکەوە بووین، یان من لە ماڵی ئەوان بووم یان ئەو لە ماڵی ئێمە.

لە یەکێک لەو ڕۆژانەدا، بەیانیەکی زوو نوێنەرێکی تایبەتی لە خەستەخانەوە هات بۆ ماڵی میلیاس و پێی ڕاگەیاندین کە خانی ئەم سپێدەیە سەعات چوار مردووە.

*** *** ***

بە پێچەوانەی خەڵکانی غەریبی ترەوە کە لە وولاتانی دورەوە دەهاتنە ئێرە و پیر دەبوون و دەمردن و وەسیەتیان دەکرد تەرمەکانیان ببەنەوە خاکی خۆیان بیاننێژن، خانی تا لە ژیاندا مابوو کەم و زۆر خۆی لە بابەتێکی لەو جۆرە نەدا. بۆیە لە هەمان ئەو گۆڕستانەی باوکمان لێ ناشتبوو، ناشتمان.

ڕۆژی ناشتنەکەی خانی ڕەشەبایەک بە توورەیی دنیای ڕادەوەشاند، بەڕادەیەک هێندەی نەمابوو ئەو بایە توندە جەنازەکە لە سەر شانی ماتەمگێڕەکان بخاتە خوارەوە. یەکێک بوو لەو ڕۆژانەی کە خانی تا لە ژیاندا بوو بەو ڕۆژانەی دەگوت ڕۆژی قیامەت. هیچ بارانێک نەدەباری، بەڵام دنیا بە هەورێکی سپیپات داپۆشرابوو، بەڕادەیەک ئەگەر هەر کەسێک وەک ئێمە تازیەباریش نەبووایە دیمەنی ئەو هەورە ڕەنگپەڕیوانە لە ئاسۆدا و ئەو بایە ساردەی شارەکەمانی کردبوو بە نیمچە چۆڵەوانیەک بەس بوون بۆ ئەوەی دڵتەنگ بێت. ئەو ڕۆژە من شارەکەمانم وەک یەکێک لە تابلۆکانی "کاسپەر دەیڤید فریدریک" بە ناوی "عەوداڵێک بە سەر دەریایەک لە تەمەوە"، هاتە بەرچاو. چۆڵ و خەماوی و بێواز. میلیاس بە پاڵتۆ ڕەشە ئاودامانەکەیەوە شانی دابۆ بەر یەکێک لە سووچەکانی تابووتەکەی باوکی و ملپێچێکی ڕەشی لە ملیەوە پێچابوو. با توندەکە قژە ئاڵتوونیەکەی دەهێناو دەبرد و تەزووی سەرماکەش دەموچاوی

هێندەی تر سوور هەڵگێڕابوو. ئەوانەی لەو ڕۆژەدا ئامادە بووین من و میلیاس، دایکم و پوورە ڕێبیکام، قەشە لاوەکە و پیاوە هیندیەکەی دۆستمان کە بە تایبەت بۆ ئامادە بوون لە ڕێوڕەسمی ناشتنەکە لە هیندستانەوە هاتبوو، هەروەها چەند کوردێک لەوانەی لەو ساڵانەی دووایید ببوونە هاورێی خانی و چەند پیاو و ژنێکی تری دۆست و هاوەڵی دایکم و پوورە ڕێبیکام.

تا لە ژیاندا بوو، خانی یەکێک بوو لەو کەسانەی کەمترین شتی دەربارەی خۆی باسدەکرد. ئەو هەمیشە خۆی لە قسەکردن دەربارەی ڕابردووی خۆی دەبوارد، تەنانەت لای پورە ڕێبیکاشم. ئەوەش بەشێکی پەیوەندی بە بێدەنگی و نەبوونی خولقی قسەکردنی زۆرەوە  لای خانیەوە هەبوو و بەشێکیشی پەیوەندی بە خولقی هەموو ئەو کەسانەوە هەبوو کە شانازی بە ڕابردووی خۆیانەوە ناکەن. ئێمە هەر ئەوەندەمان دەزانی زیاتر لە بیست ساڵ لە مەوبەرو زۆر پێش لە دایک بوونی من و میلیاس پیاوێک بە ماندوویی و جلێکی کۆنەوە لە گەڕەکەمان دەردەکەوێت. ئەو پیاوە بە ئینگلیزیەکی یەکجار سنووردارەوە قسە دەکات و دوای ماوەیەک لە گەڵ پوورە ڕێبیکامدا دەبن بە دۆست و دواتریش دەبنە ژن و مێرد. بەو هۆیەوەی پوورە ڕێبیکام خانوویەکی لە میراتی باوانیەوە بۆ بەجێماوە هیچ هۆیەک نابینن ڕووبکەنە هیچ شوێنێکی تر بۆیە

ڕاستەوخۆ خانی دێتە ماڵەکەوە و تا ئەو ڕۆژەی دەشمرێت تێیدا دەمێنێتەوە. پاش ئەوەی من و میلیاسیش وردە وردە گەورە بووین تێگەیشتین ئەو کوڕی چ خاکێکە و چۆن ڕێی کەوتۆتە ئێرە، بەڵام کەمترین شتمان دەزانی دەربارەی وردەکاریەکانی ژیانی ئەو پێش ئەوەی ڕووبکاتە ئێرە.

من و میلیاس بە مردنی خانی وامان زانی چیرۆکی ئەو پیاوە کۆتایی پێهات، بەڵام ئەوەی ژیانی ئێمەی بە تەواوی خستە سەر ڕێڕەوێکی تر و ئەو ڕاستیەی خستە بەرچاومان کە وردەکاریەکانی ژیانی خانی دوای مردنەکەی دەست پێدەکات مەسەلەیەک بوو ئێمە قەت ڕۆژێک بە خەیاڵماندا نەهاتبوو.

ئەو ڕۆژەی باوکی میلیاسمان ناشت، لە ناو گەرمەی ماتەمینی و ئەو ڕەشەبا توندەی قیامەتی دەهێنایەوە بیرمان قەشە لاوەکە بە میلیاسی گوتبوو کە لە ئایندەیەکی نزیکدا من و تۆ پێویستە یەکتر ببینین. میلیاس ڕەزامەندی خۆی پیشاندابوو بەڵام ئەوەی بیری بۆی چووبوو هەر ئەوە ببوو کە ڕەنگە قەشە لاوەکە وەک دۆستێکی نزیکی باوکی بیەوێت بە پیشاندانی هاوسۆزی لە نزیکەوە دڵنەوایی میلیاس بداتەوە. ئەو ڕۆژەی قەشە لاوەکە هات بۆ ماڵی میلیاس ، نە من و نە میلیاس هەرگیز بیرمان بۆ ئەوە نەدەچوو لە ناو جانتاکەی

دەستی قەشە لاوەکەدا دەفتەرێک هەیە و بە دەستوخەتی خانی نووسراوەتەوە و شتی زۆر گرنگ و سەرنج ڕاکێشی تێدایە لە سەر ژیان و ڕابردووی خانی. باوکی میلیاس ماوەیەک پێش مردنەکەی بڕیار دەدات ئەو شتانەی بەلای خۆیەوە گرنگن بنووسێتەوە و داوای لە قەشە لاوەکە کردبوو بە ماوەیەک دوای مردنی ئەو بیداتە میلیاس.

میلیاس دوای ئەوەی ئەو نووسینەی کە باوکی تێیدا باسی ژیان و ڕابردووی خۆی کردبوو دەخوێنێتەوە، نووسینەکە دەهێنێت بۆ لای من و لە گەڵ منیشدا چەند جارێکی تر خوێندیەوە. ئەو شتانەی خانی لە نووسینەکەیدا باسی کردبوون بۆ ئێمە تازە و سەرنج ڕاکێش بوون بەڵام هیچیان وەکو ئەو بەشەی باسی لاسی کردبوو ئێمەی تووشی شۆک نەکرد.

ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر هەستم بەوە دەکرد میلیاس خۆی وادەهاتە بەرچاو ئەرکێکی ئیلاهی لەسەر شانە بڕوات و لاس بدۆزێتەوە. ئیتر لێرەوە بوو سەفەری میلیاس بۆ وڵاتە دوورەکانی ئەودیو ڕووباران دەستی پێکرد. سەفەرێک وەک چۆن بازرگان و مژدەدەرە مەسیحیەکان و جیهانگەڕە پورتوگالی و ئیسپانیە کۆنەکان یەکەم جار بە بینین و کڕینی بەهارات و داوو دەرمان و عاجی فیل لە

هیندستان تووشی سەرسوڕمان ببوون ئاواش من و ملیاس بە کەشفکردنی ژیان و بەسەرهاتی لاس و رزگارکردنی دەستنووسێک تووشی سەرسوڕمان بووین.

*** *** ***

# نووسراوەکەی خانی

## نەوەکانی هیرۆدۆس و خەونی پیاوانی مەشهەد

"ڕۆژی لەدایکبوونەکەم دایکم بەسەر منەوە گیان دەسپێرێت. هێشتا تەمەنیشم هەشت ساڵان دەبێت باوکم لە لایەن کودەتاچییەکانی کۆتایی ساڵانی شەستەوە دەکوژرێت. ئەوان، وەک هەر دەسەڵاتدارێکی تری ناوچەکە کودەتاچییەکانی پێش خۆیان لە خوێنی خۆیاندا دەگەوزێنن و پایتەخت پڕ دەکەن لە کەلەسەری کوژراوەکان. دوای ئەوەی دڵنیا دەبن لە پاککردنەوەی ئەفسەر و کاربەدەستانی حکومەتی سەربازیی پێشوو، وەک گورگی برسی بە شاروگوندەکان وەردەبن و نەیارانی خۆیان هەڵدەدڕن.

لەو ئاگربارانەی ئەو ڕۆژانەدا کۆمەڵێک سەرباز باوکم و چەند کەسێکی تر بە نوێژی نیوەڕۆ و لە بەرچاوی سەدان کەس گوللەباران دەکەن. سەربازەکان دەست و چاوی باوکم و پیاوەکانی تر دەبەستن و لە ناو چەقی شاردا لە بەردەم پەیکەری شاعیرێکدا ڕیزیان دەکەن و دەیاندەنە بەر دەسترێژ. ئەوانەی لەو ڕۆژەدا لە

دەوری باوکم و پیاوەکانی تر کۆکرابوونەوە و بەزۆر ناچار کرابوون چەپڵە و هەلهەلە لێبدەن گێڕابوویانەوە کە چۆن باوکم ئەژنۆی لەرزیبو و ڕەنگی پەڕیبو. گێڕابوویانەوە یەکەم دەستڕێژ بەر ناودەمی باوکم کەوتووە و تەقەی شکانی ددانەکانی لە ناو دەنگی فیشەک و چەپڵەکاندا بیسترابوو. ئیتر ئەرکی بەخێوکردن و گەورەکردنی من دەکەوێتە سەر نەنکم.

من تەمەنم بیست ساڵان بوو ژنم هێنا و ساڵێک دوای ئەوە منداڵێکمان بوو. ئەو منداڵەش جگە لە لاس کەسی تر نەبوو. تازە سێ مانگ لە تەمەنی لاس خەریک بوو تێدەپەڕی و لە چوار مانگی نزیک دەبۆوە، چێشتەنگاوێک سێ پیاوی سەیر بە پرسیار کردن ماڵی ئێمەیان دۆزیبۆوە و لە دەرگای حەوشەیاندا. کاتێک پیاوەکان لە دەرگایاندا من خەریکی تاشینی تەختەیەکی تایبەت بووم بۆ دروستکردنی چوارپایەیەکی تەختە لەو چووار پایە تەختە بچووکانەی فەقێکان لە کاتی خوێندنەوەی قورعاندا قورعانی لەسەر جێگیر دەکەن. لاس لە ناو ئەو بێشکەیەدا کە هەر خۆم بۆم دروست کردبوو خەوێکی قووڵ خەوتبو و دایکیشی خەریکی دروستکردنی مرەبای هەنجیر بوو. سێ پیاوەکە هاتنە ژورەوە، هیچ وایان پیشاننەدا ئەوان سێ غەریبن و لە ناوچەیەکی دوورەوە هاتوون، بە پێچەوانەوە ئەوان بە ڕادەیەک ماڵەکەی منیان ئاشنا هاتە بەرچاو کە

من لە ناوەوە لێیان تورە بووم. ئەوان لە منیان پرسی تۆ ناوت چییە؟ ئەدی منداڵەکەت کوا؟ شێوازی پرسیارکردنەکەیان بە شێوەیەک بوو وەک ئەوەی ئەوان بزانن من خانیم و باوکی لاسم، بەڵام تەنیا مەبەستیان ئەوە بێت من بدوێنن. من فەرمووم لێکردن و ئەوان لە هەیوانەکە دانیشتن. سێ پیاو بوون لە سەرووی تەمەنی چل ساڵیەوە. یەکێکیان بەتەمەنتر دیار بوو لە دوو پیاوەکەی تر و بە ڕادەیەک بە هێواشی قسەی دەکرد کە ئەگەر زۆر لێیەوە نزیک نەبایت لە قسەکانی تێنەدەگەیشتیت. ئەو پیاوە و پیاوە مامناوەنجیەکە هەردووکیان سەرو دەستێک جلی شۆڕی ئاودامانی خاکیان لەبەردابو و زۆر کەم قسەیان دەکرد. زۆربەی قسەکان ئەو پیاوەی تەمەنی لە دووەکەی تر کەمتر دیار بوو دەیکرد. ئەو چاکەتێکی وەک چاکەتی سیحربازەکانی لە بەردا بوو. تەختی چاکەتەکەی ڕەش بوو و بە زەخرەفەی کۆنی ئێرانی چنرابوو. ڕیشێکی تەنکی بەردابۆوە و نیگایەکی خەواڵووی هەبوو. ئەو ناوی تەهماسپ بوو. بۆ ئەوەی ئێوە لە سەرجەمی سەرگوزەشتەکە تێبگەن، من بە پێویستی دەزانم باسی تەهماسپ و برادەرەکانیتان بۆ بکەم.

تەهماسپ کوڕی مەلایەک دەبێت لە یەکێک لە گوندەکانی ناوچەی سەبزەوار. دوای ئەوەی باوکی تەهماسپ لەگەڵ ئاغای گوندەکەی

خۆیان لە سەر مەسەلەی سەرفیترە و زەکات لێیان دەبێت بە کێشە، گوندەکە بە جێدەهێڵێت و لەگەڵ ژنەکەی و تەهماسپی کوڕی کە ئەوسا تەمەنی نۆ ساڵان دەبێت، ڕوو دەکەنە شاری مەشهەد. دوای ماوەیەکی کەم لە مەشهەد ناوبانگێکی چاک پەیدا دەکات و تێکەڵی کۆڕی پیاوانی دانای ئەو کات دەبێت و گوزەرانیان زۆر بەرەو باشی هەڵدەکشێت. تەهماسپی کوڕیشی هەر لە منداڵیەوە زۆربەی زاناکانی ئەو کاتەی شارەکە لە ماڵی خۆیان دەبینێت و گوێی لە گفتوگۆکانیان دەبێت. تەهماسپ خاوەنی بەهرە و زیرەکیەکی تایبەت دەبێت لە نەحو و سەرفی عەرەبیدا و ئارەزوویەکی زۆری دەبێت لە وتوێژکردن لە سەر کێشە فیقهیەکان. بەڵام بە پێچەوانەی مەیلی باییەوە هیچ حەزی لە پیشەی مەلایەتی نابێت، ئەوەش بە تەواوی بابی دەخاتە دڵەڕاوکێوە. ئەوەی یەکجاریش باوکی تەهماسپ دەتۆقێنێت ئەوە دەبێت کە بۆی دەردەکەوێت کوڕە تاقانەکەی سەردانی پیاوێکی پیری ئەو شارە دەکات بەناوی خوسرەوی. خوسرەوی بەوە بەناوبانگ دەبێت تەفسیری خەونەکان دەکات و دەتوانێت ڕابردوو و داهاتوو بخوێنێتەوە. هەرچەندە خوسرەوی بە تەواوی بەڵگاندنەوە ڕایدەگەیەنێت ئەو پشت بە ئایەت و حەدیسەکان دەبەستێت بۆ لێکدانەوەی خەونەکان، بەڵام مەلاکان هەڵمەتێکی گەورەی ناوزڕاندنی دەکەنە سەر و لەبری ئەوەی وەک شاگردێکی

نوێی ئیبن سیرین سەیری بکەن، لە ماوەیەکی کەمدا وەک جادوگەرێک لەو جادووگەرانەی شەیتانەکان بەخێو دەکەن بەدناوی دەکەن. بەڵام تەهماسپ گوێ ناداتە ئەو هەڵمەتی بەدناوکردنە و نەک هەر پشت ناکاتە خوسرەوی بەڵکو زیاتر دەبێتە دۆستی، بەوەش بابی تەهماسپ یەکجاری هیوابڕاو دەبێت لە کوڕەکەی.

شەوێکیان تەهماسپ خەونێک دەبینێت و خەونەکە بە تەواوی هەراسانی دەکات. تەهماسپ لە خەونیدا لە میحرابی مزگەوتێکی زۆر کۆندا ئینجیلێکی بە دەستەوە بووەو ئەو بەشەی خوێندبۆوە کە باسی ئەوە دەکات چەند پیاوێکی ئەستێرەناس لە وڵاتی فارس ئەستێرەیەک دەبینن لە سەر بەیت لەحم. لەو بەشەی ئینجیلدا ئەو ئەستێرەناسە فارسانە دەچن بۆ قودس و ڕایدەگەیەنن ئەستێرەی پاشای لە دایک بووی جولەکەیان بینیوە. بەمەش هیرۆدۆسی پاشا دەپەشۆکێت و هەموو قودسیش لە گەڵیدا دەپەشۆکێت. لەو کاتەی تەهماسپ لە خەونەکەیدا ئەو بەشەی ئینجیل بە پێی گێڕانەوەی مەتتا لە ناو میحرابی مزگەوتێکی کۆندا دەخوێنێتەوە, ژنێک دەردەکەوێت و دەست بۆ ئینجیلەکەی دەستی تەهماسپ درێژ دەکات. ئینجیلەکەی لێوەردەگرێت و لە ناو تاقێکی لای میحرابەکەدا دایدەنێت کە پڕە لە چەندان چاپی جیاوازی قورئان و هەندێکیان لە پەڕۆی سەوزی تۆخەوە پێچراون. ژنەکە بە تەهماسپ دەڵێت ئەو

مەریەمی مەجدەلیە. ژنەکە داوا لە تەهماسپ دەکات پێویستە لە ماوەی دوو مانگی داهاتوودا بچێت بۆ شارێک لە وڵاتی میزۆپۆتامیا و ئەو شارە ناوی ئەربائیللۆیە. بە تەهماسپ دەڵێت هەر بە گەیشتیتنت بۆ ئەو شارە بڕۆ بۆ ناو قەڵاکەی و بچۆ بۆ ماڵێک. ئەو ماڵە هەشتەمین ماڵە و دەکەوێتە دەستی ڕاستی مزگەوتی ناو قەڵاکەوە. بڕۆ ئەو ماڵە و پێیان بڵێ ئەوان دەبێت هەرچی زووە ئەو شار و قەڵایە بەجێبهێڵن. ژنەکە پێش ئەوەی لە بەر چاوی تەهماسپ وون ببێت بە تەهماسپ دەڵێت "بچۆ بۆ ئەو ماڵە و پێیان ڕابگەیەنە منداڵەکەیان ڕۆژێک  لە ڕۆژان و لە زەمان و زەمینێکی دیکەدا دەستنووسێک ڕزگار دەکات. ئەگەر تۆ نەچیت بۆ ئەو شارە و ئەو قسەیە بە ماڵەکە نەڵێیت ئەوا نەوەکانی هیرۆدۆس منداڵەکە تاقانەکەی ژن و مێردە گەنجەکە سەردەبڕن ". ئیتر لەو کاتەی تەهماسپ دەیەوێت پرسیارێک لە مەریەمی مەجدەلی بکات خەبەری دەبێتەوە. بەیانی زوو لە خەو هەڵدەستێت و بەبێ ئەوەی تەنانەت بتوانێت نانیش بخوات یەکڕێ دەچێت بۆ ماڵی خوسرەوی تا خەونەکەی بۆ بگێڕێتەوە.

بەڵام کاتێک تەهماسپ دەگاتە ماڵی خوسرەوی بەسەر شتێکی زۆر سەیرتر لە خەونەکەدا دەکەوێت. ئەو دەمەی ژنەکەی خوسرەوی دەرگای لێدەکاتەوە و تەهماسپ دەچێتە ژوورەوە، دەبینێت

خوسرەوی لە گەڵ دوو پیاوی تردا مات و مەبهووت دانیشتوون. تەهماسپ هەر بە گەیشتنی مەبەستەکەی خۆی ڕووندەکاتەوە کە بۆچی بەو سوبحە هاتووە بۆ لای خوسرەوی و بۆی دەگێڕێتەوە چی خەونێکی سەیری بینیوە، خوسرەوی و دوو پیاوەکەی تر زۆر خراپ دەپەشۆکێن. ئینجا خوسرەوی بۆ تەهماسپی باسدەکات ئەو دوو پیاوەی تریش هەمان خەونیان بینیوە. ماوەی سەعاتێک زیاتر دوو پیاوەکە و تەهماسپ و خوسرەوی بێهەست و خوست دادەنیشن. خوسرەوی پێیان دەڵێت ئەو بە درێژایی ئەو شەستساڵەی سەرقاڵی لێکدانەوەی خەونەکان بووە قەت نەیبستووە چەند کەسێک کتومت هەمان خەون ببینن. نەک هەر ئەوە بگرە قەت نەیبیستووە تەنانەت دوو کەسیش هەمان خەون ببینن. خوسرەوی دوای ئەوەی چەند جارێک خەونەکانیان پێدەگێڕێتەوە و چەندان پرسیاریان دەربارەی وردەکاریەکانیان لێدەکات بەڵام هەر هەمان ئەنجامی دەست دەکەوێت، هەر هەمان میحرابی مزگەوتێکی کۆن، هەمان ئینجیل و هەمان ئەو بەشەی باسی سەردانی ئەستێرەناسەکانی وڵاتی فارس بۆ لای هیرۆدۆس دەکات لە قودس، هەمان مەریەمی مەجدەلی و هەمان ڕاسپاردە سەبارەت بە ماڵێک لە ناو قەڵایەکی کۆندا لە ناو چەقی شارێکدا بە ناوی ئەربائیللۆ لە وڵاتی میزۆپۆتامیا. خوسرەوی جگە لەوەی سەری سوڕدەمێنێت

بەڵام بەپێی ئەزموونی خۆی لە لێکدانەوەی خەونەکان پێیان ڕادەگەیەنێت "بینینی خەونێک ئاماژە بکات بە پاشایەکی زۆردارو خوێنڕێژی وەکو هیرۆدۆس ناکرێت نیشانەیەکی باش بێت، بۆیە من ئامۆژگاریتان دەکەم مەشهەد جێمەهێڵن و مەچن بۆ ئەربائیللۆ ".

تەهماسپ و دوو پیاوەکەی تر ئەو ڕۆژەی ماڵی خوسرەوی‌یان جێهێشتبوو بەڵێنیاندابوو نەچن بۆ میزۆپۆتامیا، کەچی دوای چەند ڕۆژێک هەرسێکیان هاتبوونەوە و بە خوسرەوی‌یان گوتبوو ناتوانن نەڕۆن. خوسرەوی پاش ئەوەی دەبینێت ئەوان زۆر سوورن لە سەر ڕۆیشتن، بە ئاشکرا پێیان دەڵێت ئەو سەفەرە ترسناکە، بەڵام دواجار بێسوود دەبێت و تەهماسپ و دوو پیاوەکەی تر لە مەشهەدەوە بەرەو ئەربائیللۆ بەڕێدەکەون.

پیاوە مەشهەدیەکان ڕۆیشتن و خوسرەوی دڵنیا بوو ئەو پیاوانە قەت ناگەڕێنەوە.

تەهماسپ خەونەکە بۆ باوکی باسدەکات و نیازی خۆی سەبارەت بە چوونی بۆ میزۆپۆتامیا پێ ڕادەگەیەنێت. باوکی نەک هەر زۆری پێ سەیر دەبێت، بەڵکو بەتوندی بیری تەهماسپی دەهێنێتەوە کە ئەو سەفەرە چەند ترسناکە. باوکی تەهماسپ بە تەهماسپ دەڵێت " ئاخر ئەی هاوار تۆ ڕۆژانە تەرمی ئەو سەربازانەی خۆمان نابینیت لە

شەڕی دژی وڵاتی دووڕوباران بۆ ناو مەشهەد دەهێنرێنەوە؟. وەک کەروێشکێک دەچیتە بەردەستیان؟. تەهماسپ بۆ تۆ نازانیت ئێمە لە شەڕداین دژی ئەوان؟

تەهماسپ دەڵێت" بابە من لە شەڕدا نیم لەگەڵ کەس، منداڵێک لە مەترسی دایە و دەبێت زوو بچم پێیان بڵێم هەرچی زووە دەربازی بکەن"

دووای ئەوەی باوکی تەهماسپ بێباکی کوڕەکەی خۆی دەبینێت هەر بە تەواوی بیری بۆ ئەوە دەچێت کوڕەکەی شێت بووبێت. ئەو ڕۆژەی تەهماسپ خوا حافیزی لە باوکی دەکات، فرمێسکەکانی باوکی دەبینێت کە بە سەر ڕیشە سپییەکەیدا لووزەو دەبەستن. باوکی زۆر بەگەرمی و سۆزەوە کوڕەکەی لە ئامێز دەگرێت، وەک ئەوەی گومانی هەبێت لە بینینەوەی.

***** ***** *****

ئەو سەر لە بەیانیەی ئەوان گەیشتنە ماڵی ئێمە بەزۆری ئەو پیاوەی لە دوو پیاوەکەی تر کەمتەمەنتر دیار بوو قسەی دەکرد. ئەو گووتی "من ناوم تەهماسپە، ئەوانەش هاوشاری و هاوسەفەری منن، ئێمە لە شاری مەشهەدی ووڵاتی فارسەوە هاتووین. هۆی هاتنەکەمان

ئەوەیە ئێمە خەونێکمان بینیوە و هاتووین پەیامی ئەو خەونەتان پێڕابگەیەنین ". تەهماسپ زۆر بە ڕێکوپێکی و لێزانانە قسەی دەکرد، بە جوانی دانی بە ووشەکاندا دەنا و تا دڵنیا نەبووایە لەوەی باسێکی تێر کردووە و ئێمەش بە تەواوی تێیگەیشتووین، دەستی بە باسێکی دیکە نەدەکرد.

ئەو گوتی "ئێمە هەرسێکمان خەڵکی وڵاتی فارسین و لە شاری مەشهەد دادەنیشین، هەرسێکمان لە یەک شەودا هەمان خەونمان بینیوە و بە پێی ئەو خەونە ئێوە پێویستە بەبێ هیچ دوودڵی و دوواکەوتنێک ئەم شارو قەڵایە جێبهێڵن. ئەگەر وانەکەن ئەوا کوڕەکەتان سەردەبڕدرێت. جگە لەوەی ئێوە منداڵەکەی خۆتان خۆش دەوێت و ناتانەوێت بمرێت، مانەوەی ئەو منداڵە زۆر پێویستە بۆ ئەوەی لە سەردەم و شوێنێکی تردا دەستنووسێک ڕزگار بکات کە ئیرادەی خوداوەند وایە تەنیا ئەو منداڵە بۆی دەلوێت ئەو دەستنووسە ڕزگار بکات". دوای ئەوەی خەونەکانیان گێڕایەوە، تەهماسپ ڕووی کردە من و گوتی" ئێمە ئەرکی خۆمان بەجێ هێنا، پێمان خۆشە لەبەرخاتری ئەو منداڵە بە قسەمان بکەیت، بەڵام هیچ دەسەڵاتیشمان نیە ئەگەر بە قسەشمان نەکەیت" ئینجا دوای کەمێکی تر پێی گوتم" براله، ئێمە ڕێگایەکی دوورمان بڕیوە و خۆمان خستۆتە مەترسیەوە تەنیا بۆ ئەوەی ئەوەت پێ بڵێین".

"ئاخر باشە کێ کوڕەکەم سەر دەبڕێت؟ بۆ سەری دەبڕێت؟ دەستنووسی چی؟" من بە بەدگومانی و ناحاڵی بوونێکی زۆرەوە ئەوەم گوت.

تەهماسپ بە نیگەرانیەوە گوتی" نەوەکانی هیرۆدۆس سەری دەبڕن، بەڵام ئێمەش نازانین بۆ سەری دەبڕن، ئێمەش نازانین کام دەستنووس" .

"نەوەکانی هیرۆدۆس؟ هیرۆدۆس دووهەزار ساڵ پێش ئێستا پاشای ناوچەی یەهودیا بووە ئێستا نەوەکانی چی دەکەن لێرە؟" من بە سەرسوڕمانەوە ئەوەم گوت.

" گوێ بگرە کاکۆ، نەوەکانی هیرودوس ئێستا لێرە فەرمانڕەوان. ئێمە نەوەکانی ئەو پیاوانەی وڵاتی فارسین کە کاتی خۆی ئەستێرەیەک دەبینن لە سەر ئۆرشەلیم و دەڕۆن کڕنۆش بۆ پاشای لە دایک بووی جولەکە بەرن، ئەو پیاوانەی هیرۆدۆس دەیەوێت بیانکوژێت و ئەوانیش هەڵدێن و دەگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان. ئەوانەی ئێستا لێرە فەرمانڕەوان لە نەوەی ئەو پاشایەن و ئەگەر بزانن ئێمە لێرەین دەمانکوژن" تەهماسپ بە ترسەوەو بە دەنگێکی نزم ئەوەی گوت.

دووای ئەوەی ئەو قسانەمان کرد کات وردە وردە ببوو بە دەمەو عەسرێکی درەنگ. من لە گەڵ پیاوەکاندا ڕۆیشتم بۆ مزگەوت بۆ ئەوەی نوێژەکانیان بکەن و بگەڕێینەوە ماڵەوە. ئەوان قەرار بوو ئەو شەوە لە ماڵی ئێمە بن و بۆ بەیانیەکەی بگەڕێنەوە بەرەو وڵاتی خۆیان. من لە حەوشەی مزگەوتەکەدا چاوەڕێم کرد تا پیاوە ئێرانیەکان نوێژەکانیان تەواو کرد و ئیتر دنیا وردە وردە بەرەو تاریکی دەڕۆیشت. لەگەڵ پیاوەکان لە حەوشەی مزگەوتەکە هاتینە دەرەوەو ویستمان بەرەو ماڵ ببینەوە. لە دوورەوە چاوم بە کۆمەڵێک چەکدار کەوت جلی کوردیان لە بەردابوو. ئەوانە پیاوانی حکومەت بوون و بەرەو لای ئێمە دەهاتن. من بەپێی ئەزموونی خۆم و ئەزموونی هەموو ئەو کەسانەی لە وڵاتی ئێمە ژیابوون تێگەیشتم ئەو چەکدارانە بۆ گرتنی من و ئەو پیاوە ئێرانیانە هاتوون. من هەر ئەوەندەم پێکرا بە دەنگێکی بەرز هاوار بکەمە ئێرانیەکان و پێیان بڵێم ڕاکەن، دیارە کاتی ئەوەم نەبوو تێیان بگەیەنم چ باسە. بەڵام پیاوە ئێرانیەکان وەک ئەوەی نوشتەی ڕەشیان لێکرابێت لە جێی خۆیان چەقین و منیش بە هەڵەداوان خۆم کرد بە نزیکترین کۆڵانی دەستی چەپمدا. کۆڵانەکە، کۆڵانێکی تاریک و تەنگەبەر بوو. ڕامکرد و ئاگام لە پیاوە ئێرانیەکان نەما.

ئەو شەوە و دوو شەوی دواتریش من لە ماڵی ناسیاوێکم مامەوە. دوواتر لە ڕێگەی ژنیماڵەکەوە زانیم چەکدارەکان دوای ئەوەی پیاوە ئێرانیەکانیان دەستگیر کردووە، چوون بۆ ماڵی ئێمە و ژنەکەشمیان بردووە، بەڵام بە هۆی ئەوەی لەو کاتەدا ژنەکەم بۆ ئەوەی خوواردنی ئێوارە بۆ میوانەکان دروست بکات منداڵەکەمانی لای بێوەژنەکەی دراوسێمان دانابوو، پیاوەکان نەیانتوانیبوو منداڵەکەش بەرن.

من تێگەشتم دۆخەکە زۆر ترسناکە و ئیتر ناتوانم لەوە زیاتر لەو شارەدا بمێنمەوە و تەنانەت مانەوەم مەترسی دەبێت بۆ ئەو ماڵە ناسیاوەشمان، بۆیە شارم جێهێشت و ڕووم کردە شاخ بۆ ناو ئەو جەنگاوەرانەی ئەو کات بەسەختی لە جەنگدا بوون دژی حکومەت. من لە دووای ئەو ڕۆژەوەی شارم بۆ یەکجاری جێهێشت، دوو جاری تر لاسم بینیەوە. ماوەیەکی چەند مانگیی تێپەڕی و هیچ هەواڵێک لە ژنەکەمەوە نەبوو. ئیتر زانیمان جارێکی تر نایبینینەوە. پێویستە ئەوەش بزانن هەر کەسێک لە ساڵانی هەشتاکاندا لە عێراق وونبووبا ئەوا پەیدابوونەوەی تەنیا لە توانای موعجیزەکاندا بوو. بۆیە من لەگەڵ ئەو ژنەی دراوسێمان ڕێککەوتم منداڵەکە بۆ خۆی بەخێو بکات و بە تەواوەتی وەکو منداڵی خۆی بیگرێتە خۆی. تکایە میلیاس من داوا لە تۆ دەکەم، تۆش ئەگەر لاست بینیەوە لە دەمی

منەوە داوای لێبکە کە ئەگەر مەبەستتانە لەوە تێبگەن من بۆچی ڕازی بووم لاس ببەخشمە ژنێکی دراوسێمان؟ بۆچی ڕاستی وونبوونی ژنەکەم و زۆر ڕاستی ترم لە لاس شاردەوە؟ ئەگەر دەتانەوێت تێبگەن من بۆچی جارێکی تر بۆم نەلوا لاس ببینمەوە؟ بۆچی ڕووداوەکان بە ئاراستەیەکی ئاوا ئالۆزدا ڕێیان کرد؟ بۆچی ڕامکرد و خۆم وون کرد؟ بۆ وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە تکایە هەوڵ بدەن لە ساڵانی هەشتاکانی عێراق تێبگەن. چونکە ئەگەر ئێوە لەو ساڵانە تێنەگەن هەرگیز ناتوانن لە من ببوورن، هەرگیز ناتوانن چاوپۆشیم لێبکەن لەوەی دنیایەک ڕاستیم لێتان شاردۆتەوە. بەڵام ئەگەر ئێوە توانیتان لەو دۆزەخە تێبگەن کە دۆزەخی ڕاستەقینەی ساڵانی هەشتاکانی عێراقە، ئەوا دڵنیام بەزەییتان پێمدا دێتەوە و لە بری ئەوەی تووڕە بن لێم، دڵنیام وەک یەکێک لە قوربانیەکان لە ناو ملیۆنان قوربانی تردا سەیرم دەکەن. دەبێت ئەوەش بزانن من زۆر جار لە دڵی خۆمدا بڕیارم داوە هەموو شتێکتان بۆ باس بکەم، بەڵام ترساوم لەوەی هەتا دەمرم لۆمەم بکەن، هەتا دەمرم تێمنەگەن، ترساوم لەوەی نەمبوورن.

بێوەژنەکەی دراوسێمان بەو هۆیەی خۆی قەت منداڵی نەببوو لە خۆشیان شاگەشکە بوو بەو بەخشینە. لە سەر ئەوەش ڕێککەوتین

لەلای هەموو کەس واینیشانبدەین ئەو منداڵە هی ئەوە و باوکی لە یەکێک لەشەڕەکاندا تیاچووە.

من حەوت مانگ لە شاخ بووم و ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر بێهودەیی ئەو شەڕەم بۆ دەردەکەوت کە تێی کەوتبووین. بەڵام ئەوەی بەتەواوی منی بێئیمان کرد کوشتنی دوو سەربازی دیل بوو".

***　　***　　***

# کوشتنی دوو سەربازی دیل

"شەوێکیان کۆمەڵێک پێشمەرگە بووین ویستمان بنکەیەکی سەربازی بچووک بگرین. دوای ئەوەی بە شێوەیەکی خێرا هەڵمانکوتایە سەر بنکەکە و گوللەیەکی زۆرمان نا بە بنکەکەوە، چاوەڕێی بەرەنگاریەکی سەختمان دەکرد. بەڵام بە پێچەوانەی چاوەڕوانی ئێمەوە، هیچ بەرەنگاریەکمان بەرەو ڕوو نەبووەوە. کەمێک وەستاین و بینیمان لە ناو بۆنی barووت و تەمومژی ئەو شەوەوە تارمایی دوو سەرباز دەرکەوتن و دەستەکانیان بەشێوەی تەسلیم بوون

بەرز کردبۆوە. ئێمە بە دوودڵیەوە چاوەڕێمان کرد تا زیاتر لێمان نزیک بوونەوە. کاتێک گەیشتنە لامان یەکێکیان بە هۆی تەقەکانی ئێمەوە قاچی بریندار ببو. بە شێوەی شەلینەکەیدا دیار بوو ئازارێکی زۆری هەیە. ئەوەی تریشیان هەموو مووەکانی قژی و ڕیش و سمێڵ و برۆ و برژانگەکانی هەڵکڕوزابوون، بەڵام هیچ شوێنێکی بریندار نەببوو. ئەوان بە دەم و پلێکی تۆقیوەوە تێیان گەیاندین پێنج سەرباز لە بنکەکەدا بوون و سێیان کوژراون. من هەر لەوێوە هەستم بە گوناهێکی لەڕادەبەدەر کرد بەوەی زانیم سەربازەکان بڕیاریان دابوو هیچ بەرگریەک نەکەن و تەسلیم بن، بەڵام ئێمە تەنانەت دەرفەتی تەسلیمبونیشمان پێنەدابوون. ئەو شەوە سەربازەکانمان پێش خۆماندا و بەرەو حەشارگەکانی خۆمان بەڕێکەوتین. لە ڕێگای گەڕانەوەماندا، لە کاتێکدا بە شاخێکی سەختدا هەڵدەگەڕاین، چەند پێشمەرگەیەکمان لێیان بوو بە مشتومڕ. هەندێکیان پێیان وابوو ئێمە پێویست ناکات دوو سەرباز بەخێو بکەین و نانی دەمی خۆمانیان بدەینێ بۆیە باشتر وایە بیانکوژین، بەڵام ئەوانەی تر دەیانگوت نا با هەر بمێنن باشترە چونکە دەتوانین وەکو ئێستر ئاویان پێبێنین."

ڕەنگە میلیاس تۆ ئێستا بپرسیت " ئەدی چۆن بوو کەس نەیدەگووت ئازادیان بکەن، لە کاتێکدا ئەوان هیچ شەڕیان نەکردبو و تەسلیم ببوون؟"

"دیارە ئێوە نازانن ئێمە لە چ سەردەمێکی تاریکدا دەژیاین، من لە دڵەوە دەمویست هاوار بکەم و بڵێم ئازادیان بکەن بەڵام نەمدەوێرا وابڵێم. ئەوان دەیانزانی من باوکم لە لایەن پیاوانی حکومەتەوە گوللەباران کراوە و ژنەکەشم هەر حکومەت بێسەروشوێنی کردوە. ئەگەر وامگوتبا بێگومان زۆر بە سووک و ترسنۆک سەیریاندەکردم. بیرتان نەچێت ئەو سەردەمە سەردەمێک بوو بەزەیی عەیبەیەکی گەورە بوو. لەو ساڵانەدا مرۆڤ ڕازی بوو قەسابخانە بخولقێنێت بەڵام باری ئەو سوکایەتیە هەڵنەگرێت بەوەی بە ترسنۆک تۆمەتبار بکرێت"

"ئێ ئەی دوایی؟ چیمان لە سەربازە دیلەکان کرد؟"

دوای ئەوەی گەیشتینە سەر لوتکەی شاخەکە، پێشمەرگەکان مشتومڕەکەیان هەر بەردەوام بوو. من بە هێواشی خۆم لە فەرماندەکەمان نزیککردەوەو پێم گوت ئەو سەربازانە بەبێ هیچ تەقە و شەڕێک خۆیان تەسلیمی ئێمە کردووە، بۆیە من هیچ هۆیەکی ماقووڵ نابینم بکوژرێن.

فەرماندە پیاوێکی کەمدوو بوو بەڵام هەتا بڵێی دڵڕەق بوو. دەموچاوی ئاوڵاوی بوو و چاوی بەقووڵدا چووبوون. چەند موویەک لە برۆکانی سپی ببوون کە بە ساردی ئەو بەرەبەیانە ڕەپ ڕاوەستابوون. من ئەو قسەیەم کرد و ئەو بە ناڕازی بوونەوە گوتی 'باشە تەگبیرێکیان لێدەکەین'.

ئێمە ئیتر لە سەر لوتکەی شاخەکە بووین و دانیشتبووین بۆ ئەوەی دوا پشوو بدەین پێش ئەوەی بگەینەوە حەشارگەکانمان. فەرمانده ڕووی کردە من و پێی گوتم خانی ئەو فیشەک و ئازووخەیە لەو سەربازانە داگرە. من بە خێرایی شتەکانم لە سەر مل و پشتی سەربازەکان داگرت کە وەک بارگیر بارمانکردبوون و پێم وابوو فەرماندە بەزەیی پێیاندا دێتەوە. ئینجا فەرماندە ڕووی کردە ئەو دوو پێشمەرگەیەی مشتومڕەکەیان هەڵگیرساند بۆ ئەوەی سەربازەکان بکوژن و پێی گوتن 'بیانکوژن'.

من گوتم ئاخر جەنابی فەرماندە و پێش ئەوەی قسەکەم تەواو بکەم دوو پێشمەرگەکە بە گورجی هەڵسان و پشتەملی سەربازە ساغەکەیان گرت و ڕێک بردیانە قەراغی لوتکەی شاخە بەرز و هەزاربەهەزارەکە. پاڵتۆ بۆرە عەسکەریەکەیان لە بەردا داڕنی و بە چەند پارچە پەڕۆیەک هەردوو دەستی سەربازەکەیان لە دوواوە

بەست و بەبێ ئەوەی بچووکترین مۆڵەت بدەنە ئەو بەستەزمانە، بە هەردووکیان زۆر بە توندی پاڵێکیان پێوەناو لە بەرزایی ئەو شاخەوە بەریان دایەوە. من سەربازەکەم بینی وەک داڵێکی گەورە لە ناو بوولێڵی ئەو سپێدە بێدەنگەدا بەرەوخوار دەفڕی. گوێم لە قریشکەی هاواری ئەو بوو دڕی بەو تەمومژە خەستەی ئەو بەیانیە دەدا. چاوم لێبوو سەربازەکە لە فەزادا مەودایەکی بڕی و ئیتر سەری بەر تاوێرێکی گەورە کەوت و ناڵەیەکی خەمگینی لێهەستا. بەو ناڵەیە ئەو هەورانە ڕەوینەوە کە لە داربەڕووەکانی ئەو بنارە ئاڵابوون. دووای ئەوەی دوو پێشمەرگەکە سەربازێکیان لەشاخەکەوە هەڵداشت گەڕانەوە بۆ لای سەربازە قاچ زامدارەکە و ویستیان ئەویش بەرن و لە شاخەکەوە هەڵیدێرن، بەڵام سەربازە شەلەکە بەشێوەیەک تۆقیبوو کە زمانی شکابوو و بە نیگایەکی حەسرەتبارەوە سەیری ئێمەی دەکرد وەک ئەوەی لێمان بپاڕێتەوە بەزەییمان پێیدابێتەوە و یارمەتی بدەین. دوو پێشمەرگەکە پەلاماری ئەویشیاندا و ویستیان بەدەردی سەربازەکەی تری بەرن. سەربازە شەلەکە لە ترسا وەک قالۆنچەیەکی نەخۆش چنگی لە زەویەکە گیر کردبو و دوو پێشمەرگەکەش وەک ئەوەی لە سەر چیای عەرەفات بن و بیانەوێت مەڕێک بکەنە قوربانی بە مرخێشمرخێش پاڵتۆکەی ئەویشیان داڕنی و بە هەر زەحمەتیەک بوو باڵی ئەویشیان بەست.

سەربازە شەلەکە هێشتا خوێن لە قاچە زامدارەکەی دەهات و هات و هاوار و گریانێکی زۆری خستبۆ ئەو کێوانەوە، هەموو هێزی خۆی خستبۆ گەڕ بۆ ئەوەی وازی لێبهێنن و فڕێی نەدەنە ئەو بەندەنەوە. فەرماندە وەک ئەوەی تاقەتی نەبێت گوێ لە ناڵەو فیغانی ئەو دیلە بگرێت، بە پێشمەرگەکانی گوت 'بە فیشەک بیکوژن' . ئیتر یەکێک لەو دوو پێشمەرگەیە فیشەکێکی نا بە سەری سەربازەکەوە و بۆ ئەبەد بێدەنگی کرد. پاش ئەوەی فیشەکەکە سەری سەربازەکەی بە خاکەوە داکوتا، دوو پێشمەرگەکە هەردوو قاچی سەربازەکەیان گرت و ڕایانکێشاو لە شاخەکەوە هەڵیانداشت. ئەوە هەمان ئەو کاتە بوو فەرماندە گوتی 'کوڕینە درەنگە بابڕۆین تا ڕۆژ نەبۆتەوە' و ئێمە هەستاین و بەرەو حەشارگەکانمان بەڕێکەوتینەوە."

ئەرێ بەڕاست ئێمە چۆن ڕوومان دەهات خۆمان بادەین و بڵێین دژی زۆرداری خەبات دەکەین؟ باشە ئێمە ڕاستمان دەکرد دژی نادادپەروەری چەکمان هەڵگرتبوو؟.

"با، ئێمە لە پێناوی دادپەروەریدا جەنگمان هەڵگیرساندبوو، بەڵام ئاخ ئەو کاتانەی شەڕ هەڵدەگیرسێت تەنانەت لە ناو دەروونی دادپەروەرترین کەسیشدا هەزاران سەگ دەقروسکێنن و داوای خوێن و تۆڵە دەکەن. من ڕازی نەبووم و خەڵکانێکی تریش هەبوون

ڕازی نەبوون بە ناوی شەڕ کردن دژی ستەمکاری دنیا پڕ بکەین لە گوو، بەڵام ئێمە دڵی خۆمان بەوە دەدایەوە دەمانگوت ئیتر شۆڕشە و کەموکورتیشی دەبێت.

من ئیتر بەتەواوی بێئیمان بووم. دوای ئەو شەوە چەند ڕۆژێک وەک کەمتیار لە ناو حەشارگەکەمان نەهاتمە دەرو بیرم هەر لای سەربازە دیلەکان بوو. کوشتنی ئەو دیلانە بە شێوەیەک دلڕەقانە بوو ئەو سەربازانەی تری بیربردمەوە کە لەخەودا لە ناو بنکەکەی خۆیاندا کوشتبومانن.

من ئیتر بڕیارمدا ڕابکەم و هەموو شتێک لە دوای خۆمەوە جێبهێڵم، هەموو شتێک، تەنانەت لاسیش"

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

# دوو لاو لە ڤینیسیا یەکتر دەناسن

ئەو دەمە و عەسرەی لاس دەگاتە ڤینیسیا سەرەتای پاییز دەبێت. کە شەو دادێت ئەویش وەکو زۆربەی ئەو کەسانەی ئاوارە و بێماڵ و قەلەندەرن لەسەر چەند پارچە موقەبایەک لە نزیک یەکێک لە وێستگەکانی شەمەنەفەر دەخەوێت. دەوروبەری نیوەشەو ڤینیسیا بێدەنگیەکی قورس و خەمناک دایدەگرێت. لاس لە سەر کۆمەڵێک موقەببا لە بەر ئەو سەرمایەی پاییز کە وەکو دووپشک ژەهر دەڕێژێتە ناو گیانیەوە و لە بەر چاوی ئەو ڕێبوارە تاکوتەرایانەی بەوێدا ڕەتدەبن سەیری ئاسمانی ساف و بێگەردی ڤینیسیا دەکات، سەیری ئاسمانی بێکۆتایی و ئەستێرەکانی دەکات و بە قووڵی هەستکردن بە غەریبیەکی موتڵەق دایدەگرێت. لاس پێش ئەوەی بگەڕێتەوە وڵاتی خۆیان چەندان جار باسی ئەو شەوەی بۆ من و میلیاس کردبوو، چەندان جار ئەوەی بۆ ئێمە گێڕایەوە ئەو شەوە چ هەستێکی سامناک و بێئەندازەی بە غەریبی و بێنرخی خۆی کردووە، چەند قێزی لە خۆی کردۆتەوە و چەند کوفری کردووە. ئەو دەیگووت ئاخر ئۆفیلیاو میلیاسە ئازیزەکەی من ئێوە بێننە بەرچاوتان ئێمە لە خاکێکەوە ڕامان کرد دنیایەک خوێن لە پێناو

ڕزگارکردنیدا ڕژابوو. ئێمە دەریایەک خوێنمان بۆ ئەوە نەبەخشی بۆ ئەوەی تف لە نیشتمان بکەین و لە ناو پارک و وێستگەی شەمەنەفەرەکانی وڵاتانی دووردا وەکو کۆمەڵێک نەفرەتلێکراو ڕابکشێین. ئەو شەوە لاس بیری لە پێکەنینە بێگوناهەکانی دەنکەهەنار کردبۆوە. تاسەی ئامێزی دایکی کردبوو کە هەمیشە بۆنێکی قورسی مێخەکی لێدەهات. بیری لە چارەنووسی خۆی کردبۆوە و سەیری ئاسمانی شین و پاکی ڤینسیای کردبوو. نیگای دابۆ درەوشانەوەی هەزاران ئەستێرە و کشانی دەیان نەیزەک و بۆ سیابەختی خۆی گریابوو.

دوای ئەوەی بۆ چەند سەعاتێک خەوی لێدەکەوێت بە دەنگی شەمەنەفەرەکان و دەنگی پێی ڕێبوارەکانی ئەو سپێدەیەی شار خەبەری دەبێتەوە. لە ناو بولێڵی ئەو بەرەبەیانەدا بە لێڵی ئەوە دەبینێت کەسێک لە نزیکیەوە لە سەر کۆمەڵێک موقەببا خەوتووە. ئەو کەسە نیوەشەوێکی درەنگ ئەو کاتەی میلیاس خەوتووە دێتە ئەو ناوەو ڕادەکشێت. کابرای نەناس لە بەر کزەی ئەو بەیانیەدا قەمسەڵەیەکی بێجی دابوو بە خۆیدا و خۆی هێنابۆوە یەک. بەرەبەرە دنیا کەمێکی تر ڕووناک ببۆوە و لاس سیمای کوڕێکی گەنجی بینیبوو کە سەری لە ژێر قەمسەڵەکەوە هێنابۆ دەرێ و تەماشای کردبوو. نیگایان دەکەوێتە سەر نیگای یەکتر و وەک

هاوسۆزیەک لەو هاوسۆزیانەی هەمیشە خەڵکانی غەریب و بێنەوا بۆیەکتر هەیانە زەردەیەک بۆ یەکتر دەکەن و لاس بە ئینگلیزیەکی خراپۆکە دەڵێت ' زۆر سارد، زۆر سارد' ، کوڕە گەنجەکەش بە نیگایەکی خەمناک و ڕۆحێکی سووکەوە وەڵامی لاس دەداتەوە و دەڵێت 'زۆر زۆر سارد سارد'.

لاس بڕیار دەبێت ئەو ڕۆژە سەعات یانزەی نیوەڕۆ بە شەمەنەفەر بەرە و ڕۆما بڕوات. لە کاتێکدا دەیەوێت سواری شەمەنەفەرەکە ببێت جارێکی تر کوڕە گەنجەکە بە سیما تاساوەکەیەوە دێتەوە بەر نیگای. ئەمجارەیان کوڕە گەنجەکە لە لاس نزیکدەبێتەوە و دەست دەکەن بە گفتوگۆ و یەکتر تێدەگەیەنن کە هەردووکیان دەیانەوێت بچن بۆ ڕۆما. لاس ئەو جارانەی باسی ئەو ڕۆژەی بۆ دەکردین هەمیشە سەرسوڕمانی خۆی ڕادەگەیاند بەوەی ئەوان چۆن توانیویانە بەو زمانە سنووردارەوە ئەو هەموو هەست و تێگەیشتنە هاوبەشەی نێوانیان بگۆڕنەوە. ئەو هەمیشە دەیگوت 'من ئێستاش تێناگەم چ هێزێک بوو من و ئیلیای بە توندی بۆلای یەکتر ڕاکێشا؟'.

بەڵام من کە ئێستا ئەو سەرگوزەشتانە دەنووسمەوە و دووای ئەوەی سەر لەبەری چیرۆکەکەم لا ڕوونە، بە باشی تێدەگەم ئەوەی لاس و ئیلیای بۆ لای یەکتر ڕاکێشا هەر تەنیا ڕێکەوتێک نەبووە،

بەڵکو هاوشێوەیی ئەو مێژووەش بووە کە ئەوان لە دوو جێگای جیاوازدا ئەزموونیانکردووە.

 ئیلیاو لاس وایان لێدێت دەبن بە دوو هاوڕێی نزیکی یەکتر و هەموو ئەو ماوەیەی لە ڕۆما دەژین بە یەکەوە دەبن. ئەو ڕۆژانەی لاس لە ڕۆما بوو، من و میلیاس هەر ئەوەندەمان لە سەر ئەو دەزانی کە خانی بۆی باسکردبووین، ئەوەش بێگومان کەمترین شت بوو. خانی زۆر جار تەلەفۆنی بۆ لاس دەکرد. هەتا ئەوەبوو ڕۆژێک بە میلیاسی گوتبوو گوایە لاس و هاوڕێیەکی ئەلبانی دەیانەوێت بێن بۆ ئێرە. ئەو ڕۆژەی لاس و ئیلیا هاتن بۆ ئێرە و من و میلیاسیش ئێوارەکەی لە سەیرکردنی پیشانگایەکی قوتابخانە گەڕاینەوە، لەگەڵ خانی ئەوانمان بینی دانیشتبوون و قسەیان دەکرد تا ڕادەیەکی زۆر سیمای لاس هەمان ئەو سیمایە بوو کە من لە خەیاڵی خۆمدا بۆم کێشابوو. ساڵێک زیاتر دوای ئەو ڕۆژە  من بە سوعبەتەوە ئەوەم بە لاس گوت، ئەو زەردەخەنەیەکی کردو گوتی " بەڵام من وێنەیەکم بۆ تۆ لە خەیاڵی خۆمدا کێشابوو هیچ لە تۆ نەدەچوو"، میلیاسیش گوتی " دڵنیام ئۆفیلیا زۆر لەو وێنەیەی ناو خەیاڵی تۆ جووانترە"، ئەوە بوو هەموومان پێکەنین.

لاس و ئیلیا ئازارێکی زۆریان چەشتبوو لە ڕۆما. ئەوان لە ناو شارێکی جەنجاڵی پڕ لە باقوبریقدا بیریان لە حاڵی خۆیان کردبۆوە و زۆر تەریق ببوونەوە. شەوانە زۆر سەرمایان ببوو و بۆ چارەنووسی ڕەشی خۆیان زۆر شیوەنیان کردبوو. ئەوان لەو پایزە ساردەی ڕۆمادا بە ڕووت و ڕەجاڵی لە ناو پارک و کۆڵانە فەرامۆشکراوەکان و نزیک وێستگەی شەمەنەفەرەکان خەوتبوون، لە کەنیسەکاندا وەک دوو گەدا نانیان خواردبوو. بە گۆشت و خوێن ئەزموونیان کردبوو غەریبی یەعنی چی، تێگەیشتبوون پەنابەریی چ شمشێرێک بە ڕۆحی ئینساندا دەچەقێنێت. بەڕادەیەک غەریبیی ئازاری دابوون کە تەنانەت کاتێک لە ماڵی میلیاسیش بوون و ئێمە هەمیشە دەمانەویست وایان پیشاندەین ئەوان دوو غەریب نین، بەڵام پێدەچوو ئەوان لەسەری ئەو سەری کێشەکەوە هاتبنەوە بۆیە قەت نەیانتووانی ببن بە یەکێک لە ئێمە.

ڕۆژێکیان لاس و ئیلیا دەیانەوێت لە ڕۆماوە بە شەمەنەفەرێک بڕۆن بۆ فەڕەنسا. لە ناو شەمەنەفەرەکەدا بۆ ئەوەی ئەو گومانە نەورووژێنن ئەوان دوو کەسی نایاسایین و هیچ بەڵگەنامەیەکی سەفەریان پێ نیە بە یەکەوە دانانیشن، بەڵکو چەند کورسیەک لە دووری یەکەوە دادەنیشن. بە ڕێکەوت کوڕێکی گەنج لە تەنیشت ئیلیاوە دادەنیشێت. کوڕە گەنجەکە بۆ ڕەواندنەوەی ئەو وەڕزیەی

ڕێگایەکی دوور دروستی دەکات لە گەڵ ئیلیادا دەست دەکات بە گفتوگۆ بەڵام لە پڕ ئیلیا دەپەشۆکێت. ئیلیا هەڵدەستێت و یەکڕێ ڕوودەکاتە ئاودەستێکی یەکێک لە فارگۆنەکان. بە بینینی ئەو هەڵسووکەوتە پڕتاو و نائاساییە هەڵدەستێت و دوای ئیلیا دەکەوێت. لاس ئەو ڕۆژە گوێی لە هەنسکی ئیلیا دەبێت کە لە ناو ئاودەستەکەدا گریابوو. لە ماڵی ئێمە کاتێک ئیلیا ئەو باسەی بۆ ئێمە گێڕایەوە دەیگوت ئەو کوڕە گەنجەی ناو شەمەنەفەرەکە زەردەخەنە و پێکەنینەکەی بە ڕادەیەک لە ئیشماعیلۆڤی هاوڕێی چووە کە ئەو بەرگەی نەگرتووە و نەیتوانیوە بەر بە گریانی خۆی بگرێت، بۆیە بەو شێوەیە ڕووی کردۆتە ئاودەستەکە. هەڵبەتە دەبێت ئەوە بڵێم ئیلیا هەمیشە و بۆ ئەبەد پێیەوە دیاربوو ئەو هاوڕێیەکی لە بەرچاوی خۆی کوژراوە، قوتابیەکانی وەک کۆمەڵێک کەرویشک قەسابی کراون. ئەو هەرگیز مەرگی تراژیدی ئیشماعیلۆڤی فەرامۆش نەکرد. ئەو بۆ ڕۆژێکیش چییە ئەو غوباری حوزنەی بە هۆی مەرگی منداڵانی شامالاوە لە سیمای نیشت، لانەچوو. دووای ئەوەی لاسیش گەڕایەوە بۆ ئەوەی لە خاکی خۆیدا بمرێت، ئیلیا لە کۆڵانەکەی ئەودیومانەوە ژورێکی بە کرێ گرت و سەرقاڵی ئیش و کاری خۆی بو و بێدەنگی و ماتیەک دایگرت کە هەرگیز لێی نەبۆوە. لەم کاتەدا کە من ئەم دێڕانە دەنووسم ئیلیا زۆربەی کاتەکان هەر بە تەنیایە.

ئەو ڕۆژانەی کار دەکات کار دەکات، ئەو ڕۆژانەی لە ماڵەوەشە بە ئەندازەیەک بێدەنگ و بێهەستە ئەگەر جار جارە نەجوڵێت بۆ ئەوەی چایەک یان قاوەیەک بۆ خۆی دروست بکات، ئینسان وادەزانێت مۆمیا کراوە.

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

# قەڵای بێوەژنەکان

ئەو نووسینەی خانی بۆ میلیاسی جێهێشتبوو من و میلیاسی سەرسام کرد, نەک هەر ئەوە بگرە میلیاس بە تەواوی خولیای ڕۆیشتن و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی لاس لە کەللەی دا. چونکە ئیتر لاس چیتر کوڕێکی غەریب و غەوارە نەبوو، بەڵکو برا نامرادەکەی میلیاس بوو. دواجار لە کۆتایی بەهاری ئەو ساڵەدا میلیاس جانتاکەی پێچایەوە و ڕۆیشت. ئەو نزیکەی دوو مانگێکی پێچوو. مانگێکیان لە ئەربائیللۆ ببوو و مانگەکەی تریشیان لە ئێران ببوو. دووای ئەوەی گەڕاشەوە زۆر خراپ تێکشکابوو چونکە هەواڵێکی هێنا هەموومانی تاساند.

هەواڵەکەش ئەوەبوو لاس لە ڕووداوێکدا کوژرابوو.

میلیاس گەیشتبۆ ئەربائیللۆ و هەرچۆنێک ببوو بە هەواڵپرسین قەلاکەو ماڵە کۆنەکەی خانی دۆزیبۆوە. ئەو کاتەی میلیاس خۆی بە ماڵەکەدا دەکات لە حەوشەکەدا پیرێژنێکی لێبوو لە ناو تەشتێکدا خەریکی شۆردنی چەند جلێکی کوردی ژنانە ببوو. کە میلیاس خۆی پێناساندبوو، پیرێژنەکە یەکەمجار کەمێک بە گومانەوە سەیری

کردبوو، بەڵام دووای ئەوەێ میلیاس زیاتر خۆی ناساندبو و پێی ڕاگەیاندبوو ئەو کوڕی خانیە و دەیەوێت قسەی لە گەڵ بکات، ژنەکە مروونەتی پیشاندابوو.

ژنەکە کاتێک نیەتی میلیاس دەبینێت بۆ مانەوە لەو ماڵە، دەچێت پیاوێکی پیری خزمیان بانگدەکات بۆ هاودەنگی زیاتر. میلیاس، بە گەڕانەوەی بۆ لامان، سەرەڕای ئەو هەواڵە ناخۆشەی دەربارەی لاس هێنای، دەیان چیرۆکی سەرنجڕاکێشی دەربارەی ئەو پیاوە گێڕایەوە. ئەو شەوە میلیاس و ئەو ژن و پیاوە دەربارەی زۆر شت قسەدەکەن. میلیاس باسی دواساڵەکانی تەمەنی خانی و نەخۆشیەکەیان بۆ دەکات، باسی لاس و ئەو ساڵانە دەکات لای ئەوان بووە. ئەوانیش باسی سەردەمی منداڵیی خانی و ونبوونەکەی بۆ دەکەن، باسی عاشقبوونی لاس و کوژرانی دەنکەهەنار و سەرهەڵگرتنی لاس و دووبارە پەیدابوونەوەی و کوژرانەکەی بۆ دەکەن. باسی پیاوە ئێرانیەکانی بۆ دەکەن.

میلیاس ئەو ماوەیەی لەو شارە دەبێت هەموو کۆڵانەکانی تەیدەکات، سەرجەم کون و قوژبنی قەڵاکە دەپشکنێت. میلیاس کە گەڕایەوە بۆ ئێرە چەندان شەو هەر باسی ئەو قەڵا کۆنەی بۆ کردم بە دیوارە چەپوچوێڕەکانیەوە، بە ماڵە وێرانەکانیەوە. باسی سیمای

مەینەتباری ئەو هەموو بێوەژنەی ناو قەڵاکەی بۆ کردم. ڕاستە ئێمە قەت گوزەرانمان زۆر باش نەبووە، بەڵام میلیاس دەیگوت ئەو هەژاریەی لەو قەڵاو لەو شارەدا بینیویەتی ترسناک بووە. میلیاس هەژاریی بینیبوو لە شێوەی مارمێلکەیەکدا بە دیواری حەوشە ڕوخاوەکانی ئەو قەڵایەدا هەڵگەڕابوو. لە ناو جۆگای پڕ گوو و میزو سیاناوی کۆڵانەکانی قەڵادا، هەژاریی لە جیاتی ئاو خوڕەی هاتبوو. هەژاریی لە هەموو قوژبنێکی ئەو قەڵایەدا چاوشارکێی لەگەڵ کردبوو، لە سیمای برسی و مەحروومی منداڵاندا، لە نیگای شەکەت و جلی کۆنی ژناندا، لەو پێکەنینانەی پیاوان بە زۆر هێنابوویانە سەر لێویان.

ئەو پیرەمێردە چەندان شەو بە درێژی باسی ئەو سەردەمەی بۆ میلیاس کردبوو کە چۆن شەوێک هەزاران سەرباز دەڕژێنە ئەو قەڵایەوە و هەرچی نێرەوەزێک لە ناو ئەو قەڵایەدا دەبێت دەیانبەن و ئیتر کەس نایانبینێتەوە. ئەو بە میلیاسی گوتبوو ئێرە قەڵای بێوەژنەکانە و ئەو پیاوانەی لێرەش دەبینرێن هەمووی چەند ساڵێکە هاتوون بۆ ئێرە. باسی ئەوەی بۆ کردبوو گوایە لاس لەم قەڵایەدا لە دایک بووە، بەڵام بە منداڵی لێرە نەژیاوە بەڵکو ساڵانێکی زۆر دواتر گەڕاوەتەوە بۆ ئێرە.

کابرای پیر پیاوێکی ڕەزاسووک دەبێت. یەکێک دەبێت لەو پیاوانەی کارەسات نەیتوانیبوو ڕۆحی نەخۆش بخات. ئەو بە میلیاسی گوتبوو "من ماوەیەکی زۆرە چاوەڕێی تۆ دەکەم، کوڕم من ئەمانەتێکی گرنگم پێیە بۆ تۆ. لاس ڕایسپاردووم تەنیا بیدەم بە تۆ".

*****

لە ڕاستیدا من پێم سەیر بوو لاس شتێکی تایبەتی هەبووبێت و لە جیاتی ئەو هەموو خەڵکە زۆرەی ئەو دەیناسین بە تایبەت منی هەڵبژاردبوو ئەمانەتەکەم بدرێتێ. کابرا پیرەکەی قەڵا بۆی باس کردم لاس دوای ئەوەی گەڕاوەتەوە بۆ ئەربائیللۆ بە ماوەیەکی کەم ڕوو دەکاتە ئێران و دواتر بە خۆی و دەستنووسێکەوە دەگەڕێتەوە. کابرای پیر گوتی هەفتەیەک دوای ئەوەی لاس دەگەڕێتەوە، شەوێک چەند چەکدارێک هەڵدەکوتنە سەرماڵی لاس و لاسیش دەرفەت دەهێنێت و ڕادەکات، بەڵام ئەوان تەقەی لێدەکەن. لاس بە برینداری خۆی دەگەیەنێتە ماڵی ئەو پیاوە و پێش ئەوەی بمرێت وەسیەت دەکات کە کتێبێک لە ناو بناغەی دیواری ماڵەکەیاندا شاردراوەتە و ئەوان پێویستە بیگەیەننە دەست میلیاس. ئەو پیرێژنەی ماڵەکەش کە لاس تا مردیش وایزانی دایکیەتی گوتی "چەکدارەکان هاتن و لاس ڕایکرد، ئەوان تەقەکانیان کردو زۆر هەوڵیاندا لاسیان بۆ

نەدۆزرایەوە، سەرجەمی ماڵەکەیان سەراوبن کردو هەرچی کتێب و دەفتەرێک هەیە بردیان".

ئەو شەوەی پیاوە پیرەکە کتێبەکەی دامێ و کردمەوە، سەیرم کرد لێی نووسرابوو مەموزین. ئینجا نازانم بۆ یەکسەر بیرم بۆ هەمان دەستنووس چوو کە بەپێی خەونی پیاوانی مەشهەد دەبوایە لاس ڕزگاری کردبا. بۆیە هەر هەمان شەو بڕیارمدا هەرچۆنێک بووە سەردانێکی مەشهەدیش بکەم و هەوڵ بدەم کابرای ئەستێرەناسی مەشهەدیش ببینم. من وەک ئەگەرێک ئەوەشم دانابوو ڕەنگە کابرای ئەستێرەناسی مەشهەدی مردبێت، بەڵام نازانم بۆ دڵم زیاتر بۆ ئەوە دەچوو هێشتا لە ژیاندا مابێت.

*****

ئەو ڕۆژەی میلیاس و کابرای پیر دەچن بۆ سەر گۆڕی لاس، ڕۆژێکی گەرمی ناخۆشی بەهارێکی درەنگی ئەربائیللۆ دەبێت. میلیاس گۆڕە بێنازەکەی لاس دەبینێت. لە سەر یەکێک لە کێلەکانی گۆڕەکەی لاس بە دەستوخەتێکی خواروخێچ نوسراوە 'کل نفس ذائقة الموت'. گۆڕەکەی لاس گۆڕێکی بچووکی گڵ دەبێت کە باڵانومای بچووکی و وردی لەشو لاری لاسە. میلیاس دەسکێک گوڵی نایلۆنیش دەبینێت لە سەر گۆڕەکەی لاس دانراوە و هەستێکی

ناخۆش و دڵتەنگکەر دایدەگرێت. میلیاس هەست دەکات ئەوە برا بێمرادەکەی ئەوە لە ژێر ئەو خاکەدا ڕاکشاوە، بۆیە بە دەنگی بەرز دەست دەکات بە گریان و خاکو خۆڵی سەر گۆڕەکە دەکات بە سەریدا و هاوار دەکات دەڵێت 'وەی کاکە وەی کاکە'.

گۆڕەکەی لاس جێدەهێڵن و دەیانەوێت بچن سەردانی گۆڕی پیاوە مەشهەدیەکانیش بکەن کە لە هەمان گۆڕستان نێژراون. لە پڕ بەبێ هیچ هۆیەکی دیاریکراو میلیاس خەونێکی کۆنی خۆی بیر دەکەوێتەوە، ئەو خەونەی یەک شەو پێش مەرگی باوکم بینیبووی. میلیاس بە تەواوەتی بۆی ڕوون دەبێتەوە ئەو پیاوانەی لە خەونەکەیدا لە ناو چنگی هەڵۆکەدا ببوون یەکێکیان باوکم ببوو، ئەوەی تریان خانی و سێهەمیشیان لاس ببوو، بەڵام زۆر هەوڵدەدات ناتوانێت چوارەم کەس بێنێتەوە خەیاڵی.

پاش ئەوەی میلیاس و پیاوەی پیر گۆڕەکەی لاس جێدەهێڵن یەکەوڕاست ڕوودەکەنە لای چەپی گۆڕستانەکە بۆ سەر گۆڕی پیاوانی مەشهەد. پیاوە پیرەکە بۆ میلیاسی باسکردبوو کە ئەو ساڵەی ئەو کرێکارێکی سادە دەبێت لە شارەوانی، بەیانیەکی زوو سەیارەیەک لەگەڵ دوو چەکداردا سێ تەرم دەهێنن بۆ لایان و پێیان دەڵێن ئەو تەرمانە پێویستە بە بێدەنگی بنێژرێن. دیارە ئەو سەردەمە

شتێکی زۆر ئاسایی بوو ناشتنی ئەو تەرمانەی بێخاوەن بوون یان خاوەنیان هەبوو و کەس نەیدەوێرا خۆیان بکات بە خاوەنیان. دوای ئەوەی دەیانەوێت بیاننێژن بۆیان دەردەکەوێت ئەو سێ کەسە هیچ کامێکیان سەریان پێوە نیە. ماوەیەک دوای ئەو ڕۆژە، پیاوەی پیر دەبیستێت سێ پیاوی ئێرانی لە ناو قەڵادا دەستگیر کراون و ئیتر ئەو بەو نیشانانەی خەڵک لێیانەوە باسیان دەکات بۆی دەردەکەوێت ئەو سێ کەسە بێسەرانەی ناشتوویانن پیاوە ئێرانیەکان بوون. میلیاس دەیگوت ئێستاش ناتوانم پێناسەی ئەو هەستە سەیرانەی لەو ڕۆژەدا هەمبوو بکەم، ئەو کاتەی لە سەر گۆڕی سێ پیاوی بێسەر کە لە ناو گۆڕەکانیاندا ڕاکشابوون، وەستابووم.

میلیاس و پیاوەی پیر بە یەکەوە سەردانی هەموو ئەو شوێنانەیان کردبوو کە ڕۆژێک لاس سەردانی کردبوون. بە بەردەرگای ماڵی دەنکەهەناردا ڕەتببوون، ڕۆیشتبوونە ئەو چایخانەیەی  لە بناری قەڵاکەدا شاعیرو ئەدیبەکان لێیکۆدەبونەوەو سەردەمێک تاقە پەنای لاس ببوو. میلیاس بە لای پیاوانێکی پیردا ڕۆیشتبوو خەریکی دامەکردن ببوون و نەیانزانیبوو ئەو لە زمانیان تێدەگات و جنێویان پێدابوو. ئەوان بە میلیسیان گوتبوو ئەو قوون سوورە چ دەکات لێرە. ئەوان گوتبوویان بۆ نەیگێین و تۆڵەی شێخ مەحموود لەو ئینگلیزە سوورفلە نەکەینەوە. ئینجا میلیاسەکەی منیش دڵی ئێشابوو.

*****

ئەو کاتەی میلیاس ماڵی خوسرەوی لە مەشهەد دەدۆزێتەوە، خوسرەوی تەمەنی زیاتر لە سەت ساڵ دەبێت. خوسرەوی لەو کاتەدا ناتوانێت وەک جاران بە چوستوچالاکی بجولێت و زۆر خولقی قسەکردنیشی نابێت، بەڵام دووای ئەوەی میلیاس خۆی پێ دەناسێنێت، خوسرەوی ئارەزوویەکی زۆری بۆ قسەو گفتوگۆ تێدەگەڕێتەوە. میلیاس هەموو ئەو بەشانەی بەسەرهاتەکە هەر لە خەونی پیاوانی مەشهەدەوە تا کوژرانی لاس بۆ خوسرەوی باس دەکات، بەڵام خوسرەوی سەرسامی پیشاننادات. ئەو بە میلیاس دەڵێت هەمیشە چاوەڕوانی شتێکی لەو بابەتەی کردووە. ئینجا خوسرەوی لە میلیاس دەپرسێت "پێم بڵێ ئەدی تۆ بۆچی گەیشتوویتە ئێرە؟ چیت دەوێت؟". میلیاسیش دەڵێت " من دەمەوێت لە شتێک دڵنیا بم. ئایا ئەو دەستنووسەی لاس بۆ منی جێهێشتووە هەمان ئەو دەستنووسەیە کە بەپێی خەونی پیاوانی مەشهەد لاس دەبوایە ڕزگاری بکات؟ ئەگەر ئەوە هەمان دەستنووسە ئەدی چۆن کەوتۆتە دەست لاس؟"

بە پێی قسەکانی خوسرەوی بێت، لاس دوای ئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ مەشهەد بۆ لای خوسرەوی لێی دەپاڕێتەوە یارمەتی بدات لە

دۆزینەوەی دەستنووسەکە. خوسرەوی بە لاس دەڵێت ئەو هیچ دەربارەی ئەوە نازانێت  ئەو دەستنووسە چیە و لە کوێیە. بەڵام لاس پێداگری زۆر دەکات و لە خوسرەوی دەپاڕێتەوە هەموو زانین و ئەزموونی خۆی بخاتە کار بۆ دۆزینەوەی دەستنووسەکە. خوسرەویش بڕیار دەدات  یەکێک لە هەرە ڕێگا تایبەتیەکانی خۆی بە کار بهێنێت بۆ دۆزینەوەی دەستنووسەکە.

خوسرەوی تۆپێکی خڕ دێنێت و سەرجەم ئەو بەسەرهاتە هەر لە خەونی پیاوانی مەشهەدەوە تا ئەو ساتەی لاس دەگەڕێتەوە لای دەنووسێتەوە و دەیخاتە ناو تۆپێکی شووشەی تایبەتەوە. نەخشەی جیهانیش دێنێت و لە بەردەمی خۆیدا واڵای دەکات، ئینجا سێجار تۆپە شووشەکە هەڵدەدات بۆ ئاسمان. هەر سێ جارەکە تۆپە شووشەکە دەکەوێتە سەر ئێران. پاشتر، خوسرەوی نەخشەیەکی ئێران دێنێت و بە هەمان دەستوور سێجار تۆپە شووشەکە بە سەر نەخشەی ئێراندا هەڵدەدات، ئەمجارەیان هەر سێجارەکە تۆپەکە دەکەوێتە سەر شاری مەشهەد. دوای ئەوە نەخشەیەکی شاری مەشهەد دەهێنێت و سێجار تۆپەکە هەڵدەدات و ئەمجارەیان هەر سێجارەکە تۆپەکە دەکەوێتە سەر هەمان ماڵ لە گەڕەکێکی دیاریکراو. لاس و خوسرەوی شەوێکی فێنکی هاوین، هەمان ئەو شەوەی خوسرەوی تۆپە شووشەکە بەسەر نەخشەکەدا هەڵدەدات،

ئەو کاتەی ئاسمان ساماڵ و پڕ لە ئەستێرە دەبێت ڕوو دەکەنە دەشتێک و خوسرەوی ئاگرێکی بچووک دەکاتەوە. لەو شەوەدا مەشهەد لە دوورەوە لە ناو بێدەنگیەکی سامهێنەردا نقووم ببوو و ملیۆنان ئەستێرە بە سەر سەریانەوە درەوشابوونەوە. خوسرەوی ڕووی کردبۆ لاس و پێی گوتبوو "ئەمشەو لە بارترین شەوە بۆ ئەوەی زۆر شتمان بۆ ڕوونببێتەوە". خوسرەوی داوا لە لاس دەکات بە بێدەنگی دانیشێت و هیچ نەکات. خوسرەوی تۆپە شووشەکە بەسەر دووکەڵی ئاگرەکەدا ڕادەگرێت تا ئاگرەکە وردە وردە خامۆش دەبێت و تەنیا دووکەڵێکی باریک لە پاشماوەی ئاگرەکە بە هێمنی هەڵدەستێت و لە ژێر تریفەی ئەو مانگەشەوە سافە و ورشەی ملیۆنان ئەستێرەدا دوکەڵەکە لە ئاسمان بە جوانی دیار دەبێت. خوسرەوی هەموو سەرنجی خۆی دەخاتە سەر دووکەڵەکە و لە بەر خۆیەوە ورتە ورتێک دەکات. ئینجا ورتەورتەکە زیاتر ڕوون دەبێتەوە و لاس لێی تێدەگات. خوسرەوی گوتبووی 'بەرگی کتێبەکە چەرمی کەڵەکێوی، لاپەڕەی بیستوحەوت، پەڕەمووچی کلکی کەڵەشێر، خەتی شینی فارسی کۆن، لە یەکەم لاپەڕەدا بە خەتێکی پان و بە ڕەنگی سوور نووسراوە مەم و زین، لە ژێریشیەوە بە خەتێکی کەمێک باریکتر و بە ڕەنگی ڕەش نووسراوە شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ ئەلیاس لە عەشیرەتی خانی خەڵکی

مەملەکەتی بایەزیدو بۆتان'. لاس بۆ ماوەیەک وادەزانێت خوسرەوی شێت بووە، بەڵام لە پڕ دووکەڵەکە هەمووی ووندەبێت و ئاگرەکە بە تەواوی خامۆش دەبێت. ئەوەی دەمێنێتەوە وورشەی ئەو هەموو ئەستێرەیەیە کە ئاسمانی سافی ئەو شەوەیان تەنیبوو. خوسرەوی بە لاس دەڵێت تەواوە، هەموو شتێک تەواوە، با بڕۆین. ئیتر دەگەڕێنەوە ناو شار.

بۆ شەوی دوواتر لاس و خوسرەوی ڕوو دەکەنەماڵێک و مەبەستی هاتنەکەیانیان بۆ ڕووندەکەنەوە. خاوەنی ماڵەکە پیاوێکی دەوڵەمەندی شاری مەشهەد دەبێت و ناوبانگی خوسرەوی بیستبوو. خوسرەوی هەموو بە سەرهاتەکە هەر لە خەونی پیاوانی مەشهەدەوە هەتا هاتنی لاس بۆ خاوەن ماڵەکە دەگێڕێتەوە. ئینجا خوسرەوی داوای دەستنووسەکەیان لێدەکات، بەڵام کابرای خاوەنماڵ زۆر دڵنیا نابێت، بۆیە دەیەوێت بزانێت چۆن لاس و خوسرەوی زانیویانە دەستنووسێک لەو ماڵەیە. کابرای خاوەنماڵ بە کەمێک شەرمەوە بە خوسرەوی دەڵێت کە ئەوان پابەندن بە وەسیەتێکی کۆنی باب و باپیرانیانەوە. وەسیەتەکەش ئەوە دەبێت گوایە ئەوان ئەو دەستنووسە تەنیا دەبێت بدەن بە کەسێک کە هەموو نیشانەکانی دەستنووسەکە هەڵبهێنێت. ئیتر لاس ڕوو دەکاتە کابرای خاوەنماڵ و پێی دەڵێت' دەستنووسەکە ناوی مەموزینە و لە

لایەن شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ ئەلیاسەوە نووسراوە. لە لاپەڕەی بیست و حەوتدا پەڕەمووچێکی کلکی کەڵەشێر هەیە. بەرگی کتێبەکە چەرمی کەڵەکێویە و دەستنووسەکە بە خەتی فارسی کۆن و ڕەنگی شین نووسراوە. لە لاپەڕەی یەکەمدا و بە خەتێکی پان و بەرجەستە و بە ڕەنگی سوور نووسراوە مەموزین، لە ژێریشیەوە بە خەتێکی باریکتر و بە ڕەنگی ڕەش نووسراوە شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ ئەلیاس لە عەشیرەتی خانی و خەڵکی مەملەکەتی بایەزید و بۆتان[1].

پاش وەرگرتنی دەستنووسەکە، لاس مەشهەد جێناهێڵێت تا هەرچۆنێک دەبێت خوسرەوی ڕازی دەکات بەوەی سەرجەم ڕابردووی دەستنووسەکەشی بۆ بخوێنێتەوە.

*** *** ***

# ئێمە پیاوە ئێرانیەکانمان سەربڕی .. ئێمە لاسمان کوشت

وابزانم هەمووی ساڵێک تێپەڕیبوو بەسەر ئەوەدا کە ئامۆژنم کچێکی ببوو و ناویان نابوو دەنکە هەنار. عەسرێک خەبەریان داینێ سێ پیاوی ئێرانی لە ماڵێکی ناو قەڵادان. دەبێ ئەوە بڵێم پێشتر ئێمە زۆر کەسمان کوشتبوو و سەرەکانیانمان بردبوو بۆ پایتەخت و پارەیەکی باشمان پێوەرگرتبوون. تا شەڕی ئێران و عێراق خوێناوی تر دەبوو سەری ئەو پیاوانەی سەرمان دەبڕین گرانترو بە قیمەتتر دەبوو. ئێمە چەندان جار، دەیان شەو لە نزیک مەرزەکان و پەنا تاوێری چیا سەختەکان خۆمان ماتداوە، چووینەتە بۆسەوە بۆ دەستگیرکردنی کۆڵبەرو پیلەوەرەکان، ئەوانەی ئەو برسێتی و قاتوقڕیەی جەنگەکە لەگەڵ خۆیدا هێنابووی پاڵی پێوەنابوون بۆ گوزەرانیان خۆیان بخەنە مەترسیەوە. ئەو کاتانەی هیچ ئێرانیەکمان دەستگیر نەدەبوو سەری یەکێک لە شوانکارە عێراقیەکانمان لەگەڵ دەستی خۆماندا دەمانبردەوە. بۆیە ئەو کاتەی هەواڵی هەبوونی سێ پیاوی ئێرانیمان لە پەنا دەستی خۆمان پێگەیشت لە خۆشیان بڕوامان نەدەکرد. بۆ دڵنیابوون لە ڕاستیی هەواڵەکە دەستوبردێکی

چاکمان کرد. خێرا دەستەکەی خۆمانم کۆکردەوە و بە سواری زیلێک بەرەو قەڵا سەرکەوتین. یەکڕێ بەرەو مزگەوتەکەی نزیک ماڵی ئەو پیاوەی ناوی خانی بوو ڕۆیشتین. ئێمە پێشتر ئاگادار کرابووین لەوەی ئەوان بۆ نوێژی ئێوارە ڕوویان کردۆتە مزگەوت. ئەو کاتەی ئێمە لە مزگەوتەکە نزیک دەبووینەوە هەمان ئەو کاتە بوو نوێژکەرەکان لە دەرگای حەوشەی مزگەوتەکە دەهاتنە دەر کە بۆیاخێکی سەوزی تۆخی ناشیرین کرابوو. ئێمە لە دوورەوە خانی و سێ پیاوە ئێرانیەکانمان بەدی کرد. من بە تەواوی توانیم لە دوورەوە ئەو شڵەژانەی خانی بە بینینی ئێمە تووشی بوو ببینم. کەمێک نزیکتربووینەوە و لە پڕ خانی ئیستێکی کرد و بە دەنگێکی بەرز هاواری کردە پیاوە ئێرانیەکان کە ڕابکەن و ئیتر خۆی ڕایکرد. ئەو کاتەی خانی  خۆی کرد بە کۆلانێکی تەسکدا و لەناو تاریکایی ئەو ئێوارەیە و تەسکیی کۆلانەکەدا ونبوو، پیاوە ئێرانیەکان بە حەپەساوی لە جێگای خۆیاندا وەستان و بە دەمی کراوەوە سەیرێکی کۆلانەکەیان کرد. ئینجا ڕوویان کردە ئێمەو دەستیان بە شێوەیەکی زەلیلانە بەملاولای خۆیاندا شۆڕکردەوە. پێم خۆشە ئەوەش بڵێم من بە بینینی ئەو جۆرە دەست شۆڕکردنەوانە ئاشنا بووم چونکە ئەوە یەکەمجار نەبوو دیمەنی ئەو پیاوە بێگوناه و بێدەسەڵاتانە ببینم، ئەو پیاوانەی لەبەردەم مندا دڵنیا بوون

ڕووبەڕووی چارەنووسێکی تاڵ بوونەتەوە و بە شێوەیەکی نائاگایانە و خۆڕسک دەستیان شۆڕدەکردەوە تا تێم بگەیەنن کە ئەوان یەخسیرن.

قۆڵبەستکردنی پیاوە ئێرانیەکان و سەرخستنیان بۆ ناو زیلەکە لە ئاو خواردنەوە ئاسانتر بوو، بەڵام من هەستم بە شکان دەکرد بەوەی خانی وا بە ئاسانی لە دەستم دەربچێت. جگە لەوەش من دەمتوانی بە دەستگیرکردنی ئەویش پارەیەکی زیاتر و ڕەزامەندیەکی زیاتری حکومەت مسۆگەر بکەم، بۆیە ویستم ئەگەر خانیش نەبێت کەسێک لە بنەماڵەکەیان دەستگیر بکەم تا هیچ نەبێت خانی ناچار بکەم خۆت بدات بەدەستەوە. ئەو کاتەی ڕوومان لە ماڵەکەی کرد جگە لە ژنەکەی خانی کەسی ترمان نەبینی. ئەو ئێوارەیەی ژنەکەی خانیمان سەر خستە ناو زیلەکەوە، من تەواو لەو باوەڕەدا بووم خانی لەگەڵ زانینی هەواڵی دەستگیر کردنی ژنەکەی لە شەرمان خۆی تەسلیم دەکات بۆ ئەوەی ژنەکەی ڕزگار بکات، هەرچەندە خۆیشی تەسلیم کردبا من هەر نەمدەهێشت ژنەکەی ڕزگاری ببێت. ڕەنگە خانیش ئەوەی زانیبێت کە من لە هەموو حاڵەتێکدا ژنەکەی ئازاد ناکەم. خانی خۆی تەسلیم نەکرد، بەڵام منیش هیچ کارێکی خۆم دوانەخست. هەر هەمان ئێوارە، هەر سێ پیاوە ئێرانیەکە و ژنەکەی خانیم خستنە ژورێکی تاریکەوە. دیارە بۆ

من ئاسانتر بوو هەر بە زیندوویی تەسلیمی دەزگاکانی حکومەتیان بکەم بەڵام پیاوانی کاربەدەست زیاتر مەیلیان لەوە بوو سەری براویان بۆ ببردرێت نەک مرۆڤی زیندوو. ئەوە جگە لەوەیش ئەگەر سەرە بڕدراوەکانمان بردبا بۆ پایتەخت پارەی زیاتریان دەدا. ئەوەش کێشەیەکی زۆر نەبوو بۆ من چونکە ژمارەیەکی باش کەسانی چەورەم لە دەور بوو بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو جۆرە کارانە. هەروەها بۆ خۆشم لەگەڵ لەقەفرتێی ئەو کەسانە ڕاهاتبووم کە جارجارە سەرم دەبڕین و ڕێگەی پایتەختیش وەک ڕێگای سەرئاوی لێهاتبوو بۆ من. هەر ئەو شەوە تاقمەکەی خۆم ڕاسپارد بۆ ئەوەی پیاوە ئێرانیەکان ئامادە بکرێن. دیارە دەزانن مەبەستم لە ئامادەکردن چیە. هەر ئەو شەوە برادەران پیاوە ئێرانیەکانیان سەربڕیبوو و سەرەکانیان خستبوونە ناو گوێنیەکەوە. من بۆ رۆژی دواتر بەیانی زووەکەی شارەوانیم ئاگادار کرد ئەو تەرمانە بنێژن و ژنەکەی خانیشم تەسلیمی دەزگای هەواڵگری کرد. ئەو گوێنیەی سەرەکانی تێدا بوو خستمە ناو سنووقی دواوەی سەیارەکەمەوە و بەرەو پایتەخت کەوتمە ڕێ.

بە درێژایی ساڵانی هەشتاکان ئەوە ئیشی ئێمە بوو: گرتن و ڕاوەدوونانی ئەو سەربازە هەڵاتووانەی لە ژێرزەمینی ماڵەکاندا خۆیان دەشاردەوە، چەکدارکردنی نەوجەوانان بە تۆبزیی،

سەربڕینی شوانکارەکان. کاتێک ئاژاوەکەی ساڵی ١٩٩١ یش ڕویدا من و دەستەکەم پێمان وابوو ئەگەر لەسەر ئەو ڕابردووەی هەمان بوو دادگایی نەکرێین و لە قەنارە نەدرێین ئەوا دەبێت کاسبیەکی تر بدۆزینەوە، هەرچەندە هیچ کاسبیەکیشمان نەدەزانی. بەڵام بە پێچەوانەی چاوەڕوانیەکانی ئێمەوە و بە خۆشحاڵیەوە ساڵانی نەوەدەکانیش ئێمە بازاڕمان زۆر باش بوو. ئەو خەڵکە بێمێشکە وەک ئەوەی جادوویان لێکرابێت هەر بیریشان نەما ئێمە ڕۆژانێک ڕاوماندەکردن، ئەوەش ئیشەکەی ئێمەی ئاسانترکرد. دیارە ئێمەش کەم عەقڵ نەبووین، بۆیە کام حیزب پارەی باشتری دابایێ ئێمە ڕاوی زیاترمان بۆ ئەو دەکرد.

من تا ئەو ڕۆژەی دەنکەهەناری ئامۆزام لە بەرامبەرم ڕاست نەبۆوە قەت بەو ئەندازەیە هەستم بە تووڕەیی و غرورشکانی خۆم نەکردبوو. ئاخر بیری لێبکەنەوە من لە لایەن سەرۆکی گەورەترین حیزبەکانی وولاتەوە پێشوازیم لێدەکرا، ئاسان نەبوو کچێکی جیقن ئەو هەموو قسە ڕەقانەم لە ڕوو بدات. ئەو نیوەڕۆیەک بەردەرگای پێگرتم و پێی گوتم کە من سەردەمێک خیانەتم لە نیشتیمان کردووە. ئەو گوتی من ڕۆڵەی خەڵکم سەربڕیوە و سەرەکانیانم فرۆشتووە. ئەو گوتی من زەوی و موڵکی ئەوانم داگیر کردووە. سەرەڕای ئەوەی ئەو هەموو قسانەی کرد من دانم بە خۆمدا گرت، نەمویست

دەمودەست بیتۆپێنم و خۆم تووشی هەندێک سەرئێشەی لابەلا و ناپێویست بکەم. بۆیە هەرچۆنێک بوو هێمنم کردەوە، بەڵام لە دڵی خۆمدا بڕیارمدا لە نزیکترین دەرفەتدا نەجاتی بدەم.

من دەمزانی هەموو ئەو قسانە ئەو هەتیوە خوێڕییەیماڵیان لەسەر قەڵا بوو و دەیانگوت گوایە شاعیرە فێری کردووە. من دەمزانی ئەو جارجار دەنکەهەنار دەبینێت و زۆریشم بۆ گرنگ نەبوو، بەڵام پاش ئەوەی براکەم ڕۆژێک دەنکەهەنار و ئەوی بەیەکەوە لە باخی سەگەکان بینیبوو پێم وابوو دەرفەتێکی باش بێت بۆ ئەوەی ڕقی ئەو هەموو قسە سووکانەی ئەو کچەتیوەی ئامۆزامیان پێبڕێژم و ئەو هەتیوەش بێدەنگ بکەم کە بەردەوام لە چایخانەی ئەو گەلۆرانەی بە خۆیان دەڵێن شاعیر دانیشتووە و بە خراپە باسی من دەکات.

ئەو شەوەی دەنکەهەنارمان کوشت هەر هەمان شەو ویستمان ئەو هەتیوەش بۆ هەتاهەتایە بێدەنگ بکەین، بەڵام کاتێک ڕۆیشتینە ئەو حەوشەیەوەی ساڵانێک پێشتر بۆ گرتنی دایکی لاس چووبوومە ناویەوە، تەنیا هەر ئەو پیرێژنە پیسەی لێبوو کە خۆی کردبوو بە دایکی لاس. بۆیە ناچار گەڕاینەوە. لەو شەوە بە دوواوە کەسێکم

تەرخان کرد تا چاودێری جووڵە و هەڵسوکەوتی ئەو هەتیوە بکات، بەڵام ئێمە تا دوای چوار ساڵ لاسمان نەبینییەوە.

دوای ئەو چوار ساڵە بۆ یەکەمجار لە هەمان ئەو چایخانەیەی شاعیرەکان لێی دادەنیشتن بە بێوازی چای دەخواردەوە و زۆر لە جاران لاوازتر و خەمبارتر دیاربوو. دوای تێپەڕینی چوار ساڵ هەستم دەکرد ئیتر هیچ هۆیەک نییە من مێشکی خۆم بە هەتیوێکەوە خەریک بکەم کە بەشێوەی جلوبەرگ و هەڵسوکەوتیدا دیاربوو دەستی لە دنیا شتووە.

دەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم من ئەوم بەتەواوەتی لە خەیاڵی خۆم کردبۆ دەرێ، بەڵام هاتنی پیاوە نهێنیەکان لە ئەنقەرەوە سەر لەنوێ لاسیان هێنایەوە بەردەمم. ئەو پیاوە نهێنیانە نەخشەی قەڵایان نیشاندام و پێیان ڕاگەیاندم ئەوان بەدوای دەستنووسێکەوەن کە کوڕێکی گەنج لە ئێرانەوە هێناویەتی. بە پێی ئەو زانیاری و نەخشانە بێت کەسێک بەناوی لاسەوە دەستنووسێکی کەوتۆتە دەست و ئەوان منیان ڕاسپارد و پارەیەکی زۆریشیان بۆ پێشنیارکردم تا دەستنووسەکەیان بۆ بێنم و لاسیش سەرەونگون بکەم.

ئەو شەوەی ڕۆیشتین بۆ قەڵا بۆ هێنانی دەستنووسەکە، ویستمان لاس بگرین و بە زۆر ناچاری بکەین دەستنووسەکەمان بداتێ یان

شوێنەکەیمان پێبلێت، بەڵام ئەوەی چاوەڕوانمان نەدەکرد ڕوویدا، ئەوەش ئەوەبوو کاتێک لاس ئێمەی بینی بەسەر حەوشەکەدا بازیدا و منیش تەقەم لێکرد. دیارە من هەر بۆ ترساندنی ئەو تەقەم کرد و ویستم وای لێبکەم لە ترسا خۆی بدا بە دەستەوە، بەڵام بۆ ڕۆژی دوایی زانیمان ئەو تەقانەی من لێمکردبوو بەر شوێنی کاریگەری لەشی ئەو کەوتبوون. بەمەش هەم بۆ یەکجاری لاسم لە بەرچاو وونبوو و هەم بەتەواویش پیاوە نهێنیەکانی خەڵکی ئەنقەرە لێم نائومێد بوون. ڕاستە من لاسم کوشت بەڵام هیچ پارەیەکم وەرنەگرت. ئەوەش یەکەمجارم بوو لە هەموو ژیانمدا کەسێک بکوژم و هیچ پارەیەک وەرنەگرم.

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

دوای سەردانی میلیاس بۆ ئەربائیللۆ، ئینجا چوونی بۆ شاری مەشهەد، بینینی خوسرەوی و گەڕانەوەی بۆ ئێرە زۆربەی کاتەکان هەر سەرقاڵی ئەوە بوو لە نزیکەوە ئاگای لە چۆنیەتی بەڕێوەچوونی ئەو ئیشوکارانەوە بێت کە پەیوەندیان بە چاپکردنی کتێبەکەوە هەبوو. دووای گەڕانەوەی بە چەند ڕۆژێک یەکتربینینێکی لەگەڵ

بەڕێوەبەری یەکێک لە خانەکانی بڵاوکردنەوەی نووسینە ڕۆژهەڵاتیەکان دانا. لەو دیدارەدا بەڕێوەبەری خانەکە بەڵێنی بە میلیاس دابوو ئەگەر دەستنووسەکە مەرجەکانی نووسینێکی بە بڕشت و باشی تێدا بێت چاپیبکەن. ئەوە بوو میلیاس دەستنووسەکەی برد بۆ ئەوان بۆ ئەوەی لیژنەیەکی پسپۆڕ بیخوێنێتەوە. هەمووی کەمتر لە مانگێکی پێچوو کە لە لایەن خانەی بڵاوکردنەوەکەوە پەیوەندی بە میلیاسەوە کراو ڕەزامەندی خۆیان بۆ چاپکردنی دەستنووسەکە نیشان دا. چاپکردنەکە بە بێ کێشە و دوواکەوتن تێپەڕی. هەر لەگەڵ بڵاوکردنەوەشی ژمارەیەکی زۆر باشی لێفرۆشرا و لە لایەن ڕۆژنامە زۆر باشەکانەوە لەسەری نووسرا. لەلایەن خوێنەرانێکی زۆرەوە نامەی جۆراوجۆری دەستخۆشی بۆ خانەی بڵاوکردنەوەکە هات و هەمووان سەرسامیی خۆیان بەرامبەر عەشقی گەورەی کاراکتەرەکان، بەرامبەر ئەو ئازارەی مەم چەشتوویەتی بۆ عەشقی کچی میر زێندین، بەرامبەر هاوڕێیەتی بێفێڵ و بێڕیای تاژدین بۆ مەم، دەردەبڕی. هەروەها خوێنەرانێکیش هەبوون سەرسوڕمانی خۆیان نەشاردبۆوە بەرامبەر بەو هەمو ڕقەی کەسێک دەکرێت لە ناو خۆیدا پەروەردەی بکات. لەوەش مەبەستیان بەکر مەرگەوەڕ بوو. بەڵام یەک تاقە خوێنەرێک ئاگاداری ئەوە نەبوو کە بۆ پاراستنی ئەو کتێبە ڕۆژانێک شێخ

ئەحمەدی خانی لە حەسرەتدا مردووە، کەسانێک ماڵ و ژیانی خۆیان بە جێهێشتووە و لە قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریایەکەوە ڕایانکردووە بۆ قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریایەکی تر، پیاوانێک لە مەشهەدەوە چوون بۆ ناو قەڵایەکی کۆن لە وڵاتێکی تر تا سەری خۆیان لە سەر پەیامی خەونێک دانێن، وە لە سەرووی هەمووشیەوە کوڕێکی لاو لەو سەری دنیاوە گەڕاوەتەوە بۆ ژێر چەقۆی چەند جەللادێک بۆ ئەوەی بە خوێنی خۆی ئەو دەستنووسە بکڕێت.

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

ئێوارەیەکی درەنگی کریسمەس بوو، خەڵکێکی زۆر ڕژابوونە بەردەم مەیدانە فراوانەکەی بینایەی پەرلەمان و دەوروبەری. ڕاستە سەرەتای زستان بوو بەڵام کەش ناخۆش نەبو و تا ڕادەیەک هەوا وەستاو بوو. هەزاران کەس لە سەر ئەو پردە بوون کە بە سەر ڕووباری تامسدا رایەڵکراوە و هەردوو بەری سەعاتە گەورەکەی بیک بین و ئەو بەرەی دیکەی بازنەیەکی زۆر گەورەی ئاسنی لێیەو پێی دەڵێن چاوی لەندەن دەگەیەنێت بە یەک. کەرنەڤاڵێکی گەورەی کۆبوونەوەی خەڵک بوو. دەنگوسەدای ئەو هەموو حەشاماتە ژاوەژاوێکیان دروستکردبوو بەدەست خۆم نەبوو لەو کاتەدا دڵم

پێی دەکرایەوە. میلیاس قسەی بۆ دەکردم بەڵام من زۆر بە زەحمەت گوێم لێدەبوو. ئەوەش جگە لە ژاوەژاوی خەڵکەکە بەهۆی دەنگی ئەو فیتفیتانەشەوە بوو کە منداڵان لێیان دەدا، هەروەها دەنگی ئەو دەهۆڵە زلانەی کۆمەڵێک گەنج دەیانکوتا. ئەو گەنجانە جلی سەیر و سەمەرەیان لە بەردابوو، لووتی خۆیان بە ڕەنگێکی سووری تۆخ ڕەنگکردبوو. من و میلیاس بەبێ ئەوەی پێشتر نەخشەمان بۆ کێشابێت خۆمان کرد بە یەکێک لە کابینەکانی چاوی لەندەندا. دوای کەمێک هەم کابینەکەی ئێمە و هەم دەیان کابینەی هاوشێوەی کابینەکەی ئێمە بەهۆی جووڵەی بازنەیی ئەو بازنە ئاسنە زلەوە کە لە شێوەی چەرخوفەلەکێکی زەبەللاحدا بوو، کەوتنە ئاسمان. چاوی لەندەن بە جووڵەیەکی بازنەیی هێواش دەسووڕایەوە. ئەو کابینەیەی من و میلیاسی تێدا بووین جگە لە ئێمە دوو ژن و پیاوێک و منداڵێکیشی تێدا بوو. پێدەچوو منداڵەکە لە تەمەنی حەوت ساڵان دابێت. دەموچاوی منداڵەکە لە سەر شێوەی دەموچاوی بچکۆلەی پەپوولەیەک ڕەنگکرابو و لە سەر سەریەوە دووپارچە تەلی باریک لە شێوەی سمێڵە هەستەوەرەکانی پەپوولەیەک هەبوو. لە بەشی دوواوەی شانەکانی منداڵەکە دوو باڵی دەستکرد چەسپکرابوون کتومت هەر لە دوو باڵی پەپوولەیەکی ڕاستی دەچوون بەڵام گەورەتر. میلیاس دەمی لە گوێچکەم نزیک

کردەوە و سەیری منداڵەکەی کرد. منداڵەکە لەو کاتەدا هەموو دەمولێوی خۆی خستبۆ ناو پارچەیەک پەشمەکەوە و بە هەردوو دەستی گرتبووی و  پرسیاری لێکردم ئایا حەز دەکەم منداڵێکی وەک ئەو منداڵەمان هەبێت. میلیاس دەیزانی من حەز دەکەم. من سەیری میلیاسم کرد و لە دڵەوە ئۆخژنێکم هەڵکێشا و بە نیشانەی ئەرێ سەری ڕەزامەندیەکی گەرمم لەقاند. ئەوەش ڕێک لەو کاتەدا بوو ئەو کابینەیەی ئێمەی تێدا بووین کەوتبۆ بەشی لای سەرەوەی بازنەکەی چاوی لەندەن. لەو کاتەدا لەندەن لە ناو تەمێکی دڵگیردا دانیشتبوو. من شێتی ئەو تەمومژەی لەندەنم کە هەر دەڵێی توتکە سەگە دەمی لە زەوی دەخشێنێت. دیمەنی تەمەکە لە دەرەوەی کابینەکەوە و دیمەنی ئەو منداڵەی بەتامەزرۆییەوە پەشمەکەکەی دەخوارد و جار جارێک خۆی هەڵدەبەزاندەوە بۆ ئەوەی جیکە جیکێک لەو پێڵاوانەیەوە بێنێت کە گڵۆپی ڕەنگاوڕەنگیان پێوە بوو منی گیرۆدە کرد. بۆیە وەک جووجەڵەیەک خۆم خزاندە ژێر باڵی میلیاسەوە و لەو کاتەدا من هەرگیز خەیاڵم بۆ ئەوە نەدەچوو ئەوە دواجار دەبێت من لە باوەشی میلیاسدا دەبم.

ئێمە لە کابینەکەی چاوی لەندەن دابەزین و پیاسەیەکی دوورودرێژمان بە کەناری ڕووبارەکەدا کرد. دواتر گەڕاینەوە و ویستمان بە سەر پردەکەدا بگەڕێینەوە بۆ ئەو بەر  بۆ ئەوەی

بەسەر شەقامە پانەکەی داونینگ ستریتدا و بە تەنیشت ساختومانی سەرۆک وەزیراندا درێژە بە پیاسەکەمان بدەین. لە پڕ لە سەر پردەکەوە ئاپۆرەیەکی گەورەی خەڵک لە شێوەی کۆمەڵێک پاساری ئەو کاتانەی مارێک دەبینن کۆببونەوە و غەڵبەغەڵبێکی زۆریان دروست کردبوو. هەر زوو ئێمە تێگەیشتین بە هۆی قەرەباڵخی زۆرەوە منداڵێک لە سەر پردەکەوە کەوتۆتە ناو ڕووباری تامسەوە. من لە دوورەوە کارمەندانی فریاگوزاریم بە خۆیان و بەلەمەکانیانەوە بەدیکرد، بەڵام وا دیار بوو ئەوان ئاگایان لە ئێمە نەبوو. خۆ ئەگەر ئاگاشیان لە ئێمە بوایە من گومانم هەیە توانیبایان بگەن و منداڵێک لە خنکان ڕزگار بکەن. من و میلیاس درمان بە خەڵکەکە دا و سەیرمان کرد منداڵێک بە جلێکی سپییەوە وەک قازێکی باڵشکاو لە ناو ڕوبارەکەدا شەقەشەقی بوو. میلیاس بە بێ ئەوەی هیچ قسەیەک بکات و هیچ جۆرە دوودڵیەک پیشانبدات پاڵتۆ ڕەشە ئاودامانەکەی داکەند و دای بە من و خۆی فڕێدایە ناو ئاوەکەوە. من ئەوەم باش دێتەوە بەرچاو کە میلیاس توانی دەستی بگاتە منداڵەکە، بەڵام پێم وایە ئەو کاتە منداڵەکە خنکابوو. لە گەرمەی تەماشاکردنی ئەو دیمەنەدا بووین لەپڕ شتێک بە تەواوی پێچەوانەی چاوەڕوانیی ئێمەوە ڕوویدا، ئەوەش ئەوە بوو میلیاس لە ئاوەکەدا نقوم بوو و هەڵسایەوە، ئینجا بە شێوەیەکی سەیر و ناباو کەوتە باڵ

ڕاوەشاندن. هەرچۆنێک بوو میلیاس بە جووڵەجووڵێکی شپرزە لە منداڵەکە کەمێک دوورکەوتەوە و جارێکی تریش نقوم بۆوە، ئەمجارەیان بە خێراییەکی ترسئامێز هەڵسایەوە سەر ڕووی ئاوەکە و هاوارێکی دڵتاسێنی لێبەرزبۆوە. نە من و نە هیچ لەو کەسانەی لە سەر پردەکە بووین تێنەگەیشتین میلیاس چی گوت، بەڵام دڵنیا بووین ئەو لە تەنگانەدایە و داوای یارمەتی دەکات. ساتێکی کەم دوواتر میلیاس ژێر ئاو کەوتەوە و هەمووومان چاوەڕێ بووین جارێکی تر سەرئاوبکەوێتەوە . . . بەڵام نە ئەو ئێوارەیە و نە ئەو دەیان ڕۆژەی تریش کە کارمەندانی فریاکەوتن بە شوێن میلیاسدا گەڕان نەیانتوانی لە هیچ شوێنێکی ڕووبارەکەدا بیدۆزنەوە. من ئیتر لە دوای ئەوەوە کەمترین ڕووداوم بیردێتەوە، چونکە من کاتێک هۆشم هاتەوە  لە سەر قەرەوێڵەیەک بووم لە ناو ژوورێکی سپی و سارددا. دایکم لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو. من تایەکی  توندم لێهاتبوو و بە درێژایی ماوەی بێهۆشیەکەم وڕێنەم کردبوو. ئیستاش شتێک وەک خەونێکی لێڵ دێتەوە بەر زەینم، ئەویش ئەوەیە: دوای ئەوەی منداڵەکە لە جووڵە کەوت بە خۆی و جلە سپی و باڵە خوساوەکانیەوە لە سەر ڕووی ئاوەکە دەهات و دەچوو. ئەو کاتەی کارمەندانی فریاگوزاری تەرمی منداڵەکەیان لە ئاوەکە هێنایە دەرەوە، هەمان ئەو منداڵە بوو سەعاتێک پێشتر لە ناو کابینەکەی

چاوی لەندەندا من و میلیاس بینیبوومان. سەعاتێک پێشتر ئەومان بینیبوو پەشمەکی خوواردبو و جیکە جیکی لە پێڵاوەکانی هێنابوو کە گلۆپی سوور و زەردیان پێوە ببوو.

*** *** ***

من لەگەڵ ئۆفیلیا لە خەڵکەکە نزیک بوومەوە و لە ناو ڕووبارەکەوە منداڵێکم بینی بە بەرگی سپیەوە وەک بەچکە قازێک لە ناو ئاوەکەدا شڵپە شڵپی دەکرد. کاتێک ئەو لە تاو ڕۆحی خۆی نەیدەزانی چی بکات من بە تەواوی ئەوەم لە یادکرد مەلەوانێکی باش نیم. ساڵانێکی زۆر لە قوتابخانە مەلەکردن یەکێک بوو لەو وەرزشانەی بە بەردەوامی ڕاهێنانمان لە سەر دەکرد، بەڵام مەلەش وەک هەر شتێکی تر ببوو بە بەشێک لە پرۆگرامی ئیجباری قوتابخانە بۆیە کەمتر مەیلم لێی بوو. من دەمزانی قەت نابم بە مەلەوان، بەڵام قەت پێشم وانەبوو لە ڕووبارێکدا و لە بەرچاوی هەزاران کەس و سەدان لە پیاوانی فریاکەوتن بخنکێم. ئاپۆرەی خەڵکەکە ورتەورتێکیان دەکرد هەر لە ورتەورتی پوورە هەنگێک دەچوو کاتێک دەکەونە بەر پەلاماری سوپایەک لە زەردەواڵە. من هیچ گوێم نەدایە ئەوەی دوواتر چی ڕوودەدات، پاڵتۆکەم داکەند و دامە دەست ئۆفیلیا. ڕەنگە

کەسانێک هەبن دوای خنکانەکەم پرسیاری ئەوە بکەن من بۆچی پاڵتۆکەم داناو جلەکانی ترم دانەنا؟ من بە تەواوی بیرم نایات بەڵام ڕەنگە لەو کاتەدا پێم وابووبێت هەرچۆنێک بێت کەسێک بیەوێت لە ناو ئاودا کەسێک ڕزگار بکات باشتر وایە پاڵتۆی لە بەردا نەبێت. ئەو کاتەی خۆم فڕێدایە ناو ئاوەکەوە لە دوورەوە چاوم بە کارمەندانی فریاکەوتن کەوت بە خۆیان و بەلەمەکانیانەوە. ئەوکاتەی کەوتمە ناو ئاوەکەوە لە دۆخێکدا نەبووم هۆشم بە لای ساردی ئاوەکەوە بێت کە بەهۆی سەرمای ئەو زستانەوە وەک سەهۆڵاوی لێهاتبوو. کاتێک لە منداڵەکە نزیک بوومەوە ناسیمەوە، ئەوە هەمان ئەو منداڵە بوو نزیکەی سەعاتێک پێشتر لە گەڵ ئۆفیلیادا بینیمان لە ناو کابینەی "چاوی لەندەن" دا پەشمەکی دەخوارد. ئەرێ بەڕاست دەبێ ئۆفیلیا بزانێت ئەوە هەمان منداڵە؟. تا دەستیشم نەگەیشتە منداڵەکە بۆم دەرنەکەوت توانای من زۆر لەوە کەمترە بتوانێت منداڵێک لە خنکان ڕزگار بکات، ئەو بۆ دەرکەوتنەش پەیوەندی بەو هێزە نەبینراو و ترسناکەوە هەبوو کە هەستم کرد لە ژێرەوە قاچەکانم ڕادەکێشێت. من دەستی منداڵەکەم گرت و کەمێک بەرزم کردەوە، بەڵام بەرزکردنەوەکە زۆر کەمتر بوو لەوەی منداڵەکە بتوانێت هەناسەیەک بدات و ئاوەکە لە گەرووییەوە دەرچێت یان هەست بکەم خۆشحاڵی ئەوەبێت وا کەسێک خەریکە ڕزگاری

دەکات. لەو بێنەوبەردەیەی بەرزکردنەوەی منداڵەکەدا بووم بۆ سەر ئاوەکە جارێکی تر هێزە ترسناکەکە لە ژێر ئاوەکەوە قاچەکانمی راکێشاو بە تەواوی هاوسەنگی تێکدام، ئەوەش وایلێکردم کەمێک لە مناڵەکە دوور بکەومەوە و خۆشم بکەومە دۆخێکی مەترسیدارەوە. ئیتر وەزعی من وەزعی کەسێک نەبوو بتوانێت سوور بێت لە سەر ڕزگارکردنی منداڵەکە. بە پێچەوانەوە من کەوتمە جەنگ لە گەڵ هێزێکدا کە لە هەوڵی ئەوەدا بوو بەرەو قوڵایی ئاوەکە ڕامکێشێت، ئەوەش وایلێکردم بە هەرچی هێزمە تەکانێک بدەمە خۆم و بەرەو سەر ڕووی ئاوەکە بجوڵێم. کاتێک ئەو جووڵەیەم کرد توانیم بێمەوە سەر ئاوەکە و ئەوەم کردە دەرفەتێک هاوارێکی بەهێز بکەم بۆ ئەوەی بە هانامەوە بێن. لەو کاتەیدا هاتمەوە سەر ئاوەکە توانیم ئەوەش ببینم منداڵەکە لە جووڵە کەوتووە و ئیتر تێگەیشتم منداڵەکە کۆتایی پێهات. هەر لەگەڵ ئەوەی کەوتمەوە ژێر ئاوەکەوە جارێکی تر هێزە تۆقێنەرەکە قاچەکانمی ڕاکێشایەوە. ئەو جارەیان من هەر بەڕاستی ترسی مەرگم لێنیشت، بۆیە بە ترس و زەندەقچوونێکی بێوێنەوە گورڕێکی ترم دایە خۆم و خۆم بۆ سەر ئاوەکە بەرز کردەوە. لەم جارەیاندا توانیم ئۆفیلیا ببینم لە کاتێکدا بە نیگایەکی حەپەساو و پڕ لە نائارامیەوە سەیری منی دەکرد و بە جووڵەی لەش و دەستەکانی دەیویست لەو خەڵکەی بگەیەنێت فریام بکەون.

ئێستاش هەر جارێک بیر لەو ساتەی ئۆفیلیا دەکەمەوە، سەرەڕای ئەو هەموو عەشق و هۆگریەی بۆ ئەو هەم بوو بەڵام هەستێکی لە شێوەی بەزەیی پێدا هاتنەوە دامدەگرێت، ئاخر ئەو لەو ساتە هەستیارەشدا نەیتوانی قسەیەک بکات. ئەوم بینی بە ڕاکەڕاکێکی بێئومێدانەوە بە ناو خەڵکەکەدا دەهات و دەچو و بە جووڵەو ڕەفتاری داوای کۆمەکی لێدەکردن. بەڵام ئەوەی من جۆرێک لە هەستی بەزەیی بە سەرمدا زاڵ دەبێت بەرامبەر ئۆفیلیا مەسەلەیەکە و حەز ناکەم بۆ کەسی باس بکەم، تەنانەت ئەو چەند جارەی چوومەتە خەونیشیەوە کەم و زۆر ئاماژەم بەو مەسەلەیە نەداوە چونکە ئۆفیلیا بەرگەی ئەوە ناگرێت بکەوێتە دۆخێکەوە شایستەی بەزەیی بێت.

بۆ جاری دووایی هێزە ترسناکەکە قاچەکانمی راکێشایەوە بۆ ناو قوڵایی ئاوەکە. من لەو شوێنەوە بە ناچار حاڵی بووم تازە بەربەرەکانیم پێناکرێت. ئەوەش هەستێکی زۆر ناخۆشی دامێ، بەڕادەیەک زیاتر هەستم بە نەفرەت کرد نەک ترسی مەرگ. ئەوەش هەر ڕێک لەو کاتەدا بوو کە گوێم لە دەنگی ماتۆڕی بەلەمەکانی کارمەندانی فریاکەوتن و دەنگە دەنگ و هاوار هاواریان بوو، دیاربوو گەیشتبوونە نزیک ئێمە.

هێزە تۆقێنەرەکە منی ڕاکێشایە ناو قوڵایی ئاوەکەوە و زیاترو زیاتر منی توندتر دەگرت، منیش وردە وردە هەستم بە بوونی ئەو دەکرد وەک شتێکی بینراو. دوای ئەوەی زیاتر لە دەنگە دەنگی خەڵک و بەلەمەکانی فریاگوزاری دووری خستمەوە ئەو زیاتر وەک شتێکی بەرچاو خۆی دەردەخست. ئەو هێزە لە شێوەی گێژەنێکی سپی کە لە هەزاران تاڵی ئاوریشمیی چنرابێت منی گەمارۆ دابوو. لە ڕاستیدا من هەر لەو بێچووە زۆر بچووکانەی هەنگ دەچووم کاتێک لە ناو قۆزاخەیەکدا بێت. لە سەرەتادا من هەستم بە تەنگەنەفەسی و دڵتەنگیەکی زۆر کرد. هەستم دەکرد من وردە وردە خەریکم دەخنکێم. نایشارمەوە هەر بیرکردنەوە لەوەی من دوای تۆزێکی تر ئیتر تەرمێک دەبم و چیترنا بە تەواوی دڵی دەگوشیم. من هەموو هەوڵێکمدا ئەو تارماییە ئاویەی دەتگووت لە ئاوریشم چنراوە ڕامنەکێشێت بۆ قوڵایی و هەوڵەکانم بێئاکام بوون، چارە نەبوو دەبوایە مردنی خۆم قبووڵ بکەم. بۆیە هەوڵمدا بە خۆ خەریککردن بە سەیر کردنی ئەو هەزاران مەرجانانەی لەژێر ئاوەکەدا دەبریسکانەوە، ئەو ئازارە رۆحیەی  لە ترسی مردن دەمچەشت، هێور بکەمەوە. بە بنینی مەرجانەکان تێگەیشتم من بە تەواوی لە ڕوباری تامس دوور کەوتوومەتەوە و دڵنیا بووم ئیتر من لەناو دەریایەکی گەورەدام، هەستکردنیش بەوەی تۆ لە ناو دەریایەکی

گەورەدایت و هەزاران مەرجان لە بەر دەمتا وەک فەرشێکی گەورە ڕاخراوە بۆ خۆی هەستێکی فێنک دەداتە ئینسان. هەر ئەو هەستەش بوو وای لێکردم دڵنیا بم لەوەی ئەو ئازارەم تێپەڕاندووە کە ئینسان پێش ئەوەی بمرێت بە هۆی بیرکردنەوەی زۆرەوە لە مردن دووچاری دەبێت. من هەستم کرد زیاتر هێوربوومەتەوە و ئەوەش وایلێکردم باڵەکانم زیاتر ئاوەڵاکەم و بە چێژێکی زۆرەوە بە سەر ئەو مەزرا پان و بەرینەی مەرجاندا بفڕم. من بە تەواوی ئەوەم لە یادکرد هێزی مەرگ منی ڕاکێشاوەتە ئەو شوێنە. دەفڕیم و جار جار بۆ ئەوەی دەستم بەر مەرجانەکان بکەوێت نزم دەبوومەوە و هەر بەڕاستی خۆم بە پاشا دەزانی. لە ناو قوڵایی ئەو دەریایەدا، لە ناو نەشئەی بە ئازادی هاتنوچوون لەگەڵ هەزاران ماسی و نەهەنگدا، لە پڕ تروسکایی خەمێک لە دڵمدا چەخماخەیدا. ئەو تروسکەی خەمە بیرکردنی قورسی ئۆفیلیا بوو. من بۆ ماوەی چەند چرکەیەک لە ژێر کاریگەری ئەو چێژەی هەستکردن بە تێپەڕاندنی ئازاری گیانکێشان تیایا دروستکردبووم ئۆفیلیام لە یادکردبوو، ئەوەش بە تەواوی شەرمندەی کردم. لەو کاتەدا پڕ بە دڵ حەزم کرد ئۆفیلیام لە گەڵدا بووایە، بەڵام تازە زۆر درەنگ بوو و هیچ شتێک لە دەستی مندا نەمابوو.

ئەو شەوەی یەکەمم لە ناو قوڵایی دەریاکەدا زۆر بیرم لەوە کردەوە ئایا مەیسەر دەبوو ئۆفیلیام لە گەڵدا بووایە. ئەو شەوە چەندان ئەگەرم لێکدایەوە بەڵام بۆم دەرکەوت ئۆفیلیا لە یەک حاڵەتدا دەیتوانی لەگەڵ مندا بێت، تەنها ئەگەر ئەویش لە گەڵ مندا خۆی فڕێدابا ناو ڕوباری تامسەوە.

لەو بیرکردنەوانەدا بووم کە لەشکرێکی گەورەی زیندەوەری دەریایی لە هەزاران جۆر پەیدا بوون و منیان خستە ناو گەمارۆی خۆیان و بردیانم. هەزاران ماسی گەورە و بچووک و ڕەنگاو ڕەنگ، هەزاران ئەسپی دەریایی لە شێوەی هەزاران هەیڤی بچکۆلە لە دەورم خۆیان دەلەنجاند. بێژمار ڕۆبیان لە دوامەوە دەڕۆیشتن و لە لای ڕاستمەوە ملیۆنان مارماسی سەمایان دەکرد. سەدان نەهەنگی زۆر زل پاسەوانی ئێمە بوون کە سەدان کیسەڵ خۆیان بە کلکیانەوە هەڵواسیبوو. لە لای چەپمەوە هەزاران قرژاڵی دەریایی، هەزاران سەدەفی پڕ لە یاقووتیان هەڵگرتبو و هەر لەو ئەسپانە دەچوون لە زەماوەندێکدا جیازی بووک هەڵدەگرن. من پێشتر ئەو هەموو زیندەوەرە ڕەنگاوڕەنگانەم تەنیا لە گۆڤارەکانی تایبەت بە بوونەوەرە دەریاییەکان و بەرنامە تایبەتیەکانی تەلەفزیۆن دەربارەی ژیانی ژێر ئاو بینیبوو.

لە ناو ئاپوورەی ئەو ملیۆنان زیندەوەرەدا کە بە چەندان ڕەنگی جۆراو جۆر لە شێوەی سەدان پەلکەزێڕینەدا خۆیان دەنواند، من زیاتر خۆم وەک ئیمپراتۆرێکی دەریایی دەهاتە بەرچاو. بۆیە بەدەم فڕینەوە بە هەر چوارلاو سەروخواررووی خۆمدا دەمڕوانی، هەر ڕێک وەک ئەسکەندەری گەورە ئەو کاتەی پێش ئەوەی ڕووبکاتە هیندستان سەیری سووپا زەبەللاحەکەی خۆی کردبوو بۆ ئەوەی هەست بە هەیبەت و شکۆی خۆی بکات. لە یەکێک لەو سەیر کردنانەمدا نیگام کەوتە سەر کەشتیەکی گەورە و پێدەچوو لە سالآنێکی زۆر لەوەو پێشەوە لەو شوێنە بووبێت. ئەو نەهەنگە زلەی سەرقەتارمان بوو ڕووی خۆی بەرەو کەشتیەکە وەرگێڕاو من کەمێک خۆم بۆ خوارەوە لار کردەوە. من و کاروانی دووررودرێژی ئەو ملیۆنان زیندەوەرە هەمووومان ئاراستەی خۆمان بەرەو کەشتیە بە جێماوەکە گۆڕی. لە سەر ڕووکاری کەشتیەکە کۆمەڵێک ڕۆبیان بە سەدەفێکی تا ڕادەیەک گەورە یاریان دەکرد. لەو لاترەوە و لەسەر لایەکی گۆڕەپانی کەشتیەکە کۆمەڵێک خەڵکم بینی بەڵام من نەمزانی ئەوانە چاوەڕوانی من دەکەن. کەمێکیتر لێیان نزیک بووینەوە، ئیتر هەموویان بەرەو ڕووی من هاتن و هاواریان کرد "هێی ی ی میلیاس گەیشت". من بە هاوارەکەیان کەمێک سڵەمیمەوە بەڵام کە زۆرتر لێیان نزیک بوومەوە سەیرم کرد باوکم بە

زەردەخەنەوە سەیرم دەکات. من بوونی باوکمم لەوێ چاوەڕێ نەدەکرد بەڵام نازانم بۆچی تووشی سەرسامیش نەبووم. من باوەشم کرد بە باوکما ئیتر هەموویان لە چوار دەورم کۆبوونەوە. باوکم زۆر لەش ساغ و بە کەیف دیار بوو، زۆر گەنجتریش دەینواند لەو کاتەی بۆ دواجار لە خەستەخانە بینیم. لە تەنیشت باوکمەوە خاڵە هێربەرتم وەستابو و دەسکێکی زۆر گەورەی لە یاسەمینی کێوی بە دەستەوە بوو دیار بوو بۆ منی هێناوە و هیچ برینێکیش لە سەر سینەی نەبوو. ئەو کاتەی من دەسکە گوڵەکەم لە خاڵە هێربەرتم وەرگرت دڵم لای ئۆفیلیا بوو. خاڵە هیربەرتم هەستیکرد من لەو کاتەدا بیر لە ئۆفیلیا دەکەمەوە، بۆیە بە گوێمدا چرپاندی واباشترە خەمی ئۆفیلیامان نەبێت چونکە ئەویش ڕۆژێک هەر دێت بۆ لامان. لاس بە گەرمی بەرەو ڕووم هات و ئەو کاتەی ماچی کردم پرسیاری دەربارەی دەستنووسەکەی ئەحمەدی خانی لێکردم، منیش دڵنیام کرد دەستنووسەکە تازە قەت نافەوتێت چونکە ئیتر بە هەزاران نوسخەی لێ چاپکراوە. دەنکەهەنار گوڵێکی گەورەی سووری دابوو لە قژی و پرچەکانی بە شێوەیەکی زۆر جووان هۆنرابوونەوە. دیارە من دەنکەهەنارم نەدەناسی بەڵام لاس هەر زوو گوتی ئەوە دەنکەهەنارە. لەو لاترەوە ئیشماعیلۆڤ وەستابوو و چەند هەنگاوێکیش دوورتر لەو چوار منداڵ

دانیشتبوون، کۆمەڵێک کتێب و دەفتەرو قەڵەمیان پێبوو و لە چوواردەوریشیان کۆمەڵێک بەچکە ئەختەبووت دانیشتبوون دیار بوو فێرە نووسین و وێنەکێشانیان دەکردن. کەمێکی تر ڕووم وەرسوڕاند قرژاڵێکی گەورەم بینی بە دەمە تیژەکەی پارچە کاغەزێکی دەبڕی و دەیوست بیکا بە کۆللارە بۆ منداڵێکی جل سپی. هاوارمکرد "ئۆی ی ی تۆ ئەو منداڵە نیت کە دوێنێ ئێوارە لە کابینەکەی چاوی لەندەندا پەشمەکت دەخووارد؟" بەڵام کەموزۆر حەزم نەکرد باسی خنکانەکەی بکەم، هەروەها باسی ئەوەشم نەکرد من لەسەر ئەو خۆم بە خنکان دا. بە پرسیارەکەی من منداڵەکە پێکەنی و دانە وردەکانی دەرکەوتن و هێشتا پەشمەکە پەمەییەکە هەر بە دەم و لێویەوە بوو، سەرێکی بە نیشانەی ئەرێ ڕاوەشاند. منداڵەکە جووتێک لەو پێڵاوانەی لە پێدا بوو کە گڵۆپی سوور یان زەردو سەوزو شینیان پێوەیەو کاتێک پێ لە زەوی دادەگرن جیکە جیکێکیان لێوە دێت. ئەو لە خۆشی ئەو کۆللارەیەی قرژاڵەکە بۆی دروست دەکرد هەر جیکە جیکی لە پێڵاوەکانیەوە دەهێنا. لەپڕ گوێمان لە هات و هاواری بەچکە قرژاڵێک بوو لە ناو قەوزەی تەنیشت کەشتیەکەوە دەهات و قرژاڵە دایکانەکە کۆللارەکەی دایە دەست منداڵەکە و ڕایکرد. دوواتر بینیمان بەچکە قرژاڵەکەی لە ناو قەوزەکە هێنا دەرەوە و دیار بوو بەچکەکە لە ناو قەوزەکەدا گیری

خوواردبوو. قرژاڵە دایکانەکە کەمێکیش خۆی لێ توورە کرد کە جارێکی تر بە تەنیا نەچێت بۆ ناو ئەو قەوزەیە. لە لای ڕاستی سەر ڕووکاری کەشتیەکەوە پێنج کەس دانیشتبوون دیار بو باسی منیان دەکرد. ئەو پیاوانە سیانیان سێ پیاوە مەشهەدیەکان بوون، ئەوانەی کاتی خۆی بۆ گەیاندنی پەیامی خەونێک روویان کردبۆ میزۆپۆتامیاو سەری خۆیان لە سەر دانابوو. دوو پیاوەکەی تریش ئەو دوو سەربازە عەرەبە بوون ساڵانێکی زۆر پێشتر بە دیلی کوژرابوون. ماوەیەکی زۆر لە سەر کەشتیەکە ماینەوە، بە تەواوی نازانم چەند بوو بەڵام دڵنیام دوو ڕۆژ زیاتر بوو. ئەوەشم لە ڕێگەی ئەو تیشکانەی هەتاوەوە دەزانی کە لەگەڵ خۆرهەڵاتندا دەهاتنە قوڵایی دەریاکەوە و لە گەڵ ئاوابوونی خۆریشدا وون دەبوون. ئەو ماوەیەی لەوێ ماینەوە من زۆربەی کاتەکانم بە گەڕان لە ناو کەشتیەکەو دەوروبەری بە سەر دەبرد. هەر لەوێش بوو کڵاوی ئاسنینی سەدان سەربازم بینی پڕ بوون لە گەرای ماسی. شمشێری بریقەداری جەنگاوەرانی کۆنم بینی هێشتا خوێنی مل و سنگی قوربانیەکانی پێوەبوو. قەڵغانی پۆڵای پاڵەوانانی جەنگ، ددانی زێڕی چەتەکانی دەریا، ڕمی زلی پاسەوانانی ئازا، سندووقی گەورەی پڕ لە لیرەی هەڵڕژاوم چاو پێکەوت کە پاشاکان بە دیاری ناردبوویان بۆ یەکتر و نەگەیشتبوونە دەستیان. ملوانکەی ئاڵتوونی

شازادە گەنجەکان، ئەنگوستیلەی گەورەی ئیمپراتۆرەکانم بینی بەنقێمی گەورەی شینەوە، بە نیشانەی بەخت و ئیقباڵەوە. ئەو پەیماننامە مۆرکراوانەم بینی کە لەسەر پارچەی چەرمی پان نووسرابوون. سەوڵەجانە لوولەکیەکان کە ڕەمزی هەیبەت و دەسەڵات ببوون. تاجە بێنازکەوتووەکانی ئەو پاشایانەی هەرگیز ڕۆژێک بەبیریاندا نەهاتبوو دەمرن و دەبنە خاکوخۆڵ. زنجیری ئەستووری کۆیلەکانم بینی بە ئێسقانە پانەکانی مەچەکیانەوە. خاچی شکاوی مس، ئینجیلی زێڕکفتکراو، قورعان بە زەخرەفەی ئێرانی کۆنەوە، پارچەی گەورەی فوسەیفوسا، زەنگوڵەی ملی سابرێنەکان، زەنگی بریقەداری کڵێساکان، منارەی شکاوی مزگەوتەکان، گەردانەی درێژی پڕ لە مووروووی شین، چاکەتی مەخمەڵی سەرلەشکرەکان، کاسی زیوینی مەی، چەکمەی خوێناوی ستەمگەرەکان، ئامێرە ترسناکەکانی ئەشکەنجەدان، چوارینەکانی خەیام کە لەسەر قاپی چینی هەڵکەنرابوون، سەدان گۆزەی شەراب و کوپەی دۆشاو، پەیکەری قەددیسەکان، عەبای خەلیفەکان، شووشەی مەرەکەبی شاعیرەکان، تۆماری گەورەی باجگران، پیلانی نووسراوی خیانەتکاران، شاخی کەڵەکێوی، ناڵی ئەسپەکانی سوڵتان بە بزمارە پتەوەکانیەوە، نووشتەی سەر شانی فێدارەکان، کاتژمێری دەستی ناخودا خنکاوەکان، قیبلەنومای جیهانگەڕەکان، تفەنگی

سەربازانی دلێر، تیروکەوانی ڕاوچیان، فانۆسی بەلەمەوانەکان، تۆڕی قورقوشمداری ماسیگرانم بینی. من هەموو ئەو شتانە و سەدان شتی تریشم بینی کە لەیادم نەماون. ڕۆژێکیان تا ئێوارە خۆم بەو شتانەوە خافڵاند. لە پڕ بابم کەڕەنایەکی زلی گرت بە دەمیەوە و فووی پێدا کرد و لە گەڵ فوو پێداکردنەکەشدا هەرچی زیندەوەری ناو ئەو دەریایەیە لە دەورمان کۆبوونەوە و پیاوان و ژن و منداڵانی دەستەکەشمان هەموویان هاتن. من بۆ ماوەیەک باوکمم وەک ئیسرافیل هاتە بەرچاو ئەو کاتەی جاڕی هەڵسانەوەی مردووان دەدات. دووای ئەوەی هەموومان کۆبووینەوە باوکم بە دەنگێکی فەرماندەرانەوە کە خاڵی نەبوو لە میهرەبانی تێیگەیاندین ئیتر کاتی ڕۆیشتنمان هاتووە. باوکم باڵەکانی کردەوە و ئێمەش وەکو ئەومان کرد و لە گەڵ ئەو هەزاران بوونەوەرەدا بە ناو دەریای بێکۆتاییدا دەستمان کرد بە فڕین و ئیتر ئێمە لە ئەبەدییەتدا بووین.

## سوپاس و پێزانین بۆ ئازیزان

**باران، سیروان عەول، عەتا محەمەد و هەورامان وریا قانیع کە هەریەکەیان لە ئاستی خۆیانەوە و بەشێوازی جۆراوجۆر ئەرکیان بەم ڕۆمانەوە کێشاوە. هەروەها سوپاس بۆ هونەرمەند ئازاد باستان کە بەرگی ئەم کتێبە یەکێکە لە تابلۆکانی ئەو.**